# ڕۆژێکی پێغەمبەرانە



بەرنامەی ڕۆژێکی تەواو لە ژیانی پێغەمبەردا

صلى الله عليه وسلم

عبدالوهاب بن ناصر الطريري



# ڕۆژێکی
# پێغەمبەرانە

بەرنامەی ڕۆژێکی تەواو لە ژیانی
پێغەمبەردا ﷺ



بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی کتێب: ڕۆژێکی پێغەمبەرانە (بەرنامەی
ڕۆژێکی تەواو لەژیانی پێغەمبەردا ﷺ)
نووسینی: عبدالوهاب ناصر الطريري
وەرگێڕانی: بەکر حەمەصدیق عارف





# پێشەکی

لە شاری دارخورماکاندا، شاری دڵە پاراوەکان، دڵەکەی ئۆقرەی دەگرت، چاوانی لێکدەنان... شوێن شوێنی خۆیەتی، شار شاری خۆیەتی، خەڵکەکەشی کەسوکاری ئەون.. کاتێک هاتە شاری (مەدینە) هەموو شتێکی تێدا ڕووناککردەوە، خەڵکی مەدینە و ڕووکارەکانی سروشتی شارەکە خۆشیان ویست، ئەوە کێوی ئوحودە خۆشی دەوێت و ئەوینی لەگەڵ ئاڵوگۆڕ دەکات... ئەم کوچە و کۆڵانانە لە داهاتوودا هەنگاوەکانی دەناسن، ئەو مزگەوت و ژوورە بچوکانەی لاتەنیشتی، ئەو پیاوە بە ئەمەکانەی دەوریان داوە و ئەڵقەیان داوە خۆشی دەوێن و ئەوانیش خۆشیان دەوێت، لەگەڵیان دادەنیشێت و، ڕازی تەنهایی لەگەڵ پەروەردگاریدا دەکات.



لــەم ڕۆژانــە ژیاننامەیــەدا، لەگــەڵ ســاتەکانی ڕۆژێکــی پێغەمبەرداﷺ گەشت دەکەین، وەك ئەوەی بە شێوازی ژیانە سادە و مەزنەکەی لەگەڵیدا بژین، لەگەڵ هەڵچوونی ژیانێکی شێلگیرانە و، هاوســەنگی لــەنێوان چــالاکیەکانی ژیانــدا و، تێروتــەواویی لــە دەستکەوتنی پێداویستییەکاندا.

چالاکیی ژیان و قوڵپەکانی لە ململانێی چرکەکانی ئەم ڕۆژەدا، ساتەکانی ژیانی بەبێ هەل قۆستنەوە ناگوزەرێنێت.

ڕێکەوتنەکانی ژیانی، لەگەڵ هەموو چرکەساتێکدا دەبەست، لە ماڵەکەی و، مزگەوتەکەی و، کوچە و کۆڵانەکانی شارەکەی و، ماڵی هاوەڵــەکانی و، لەســەر ڕاخــەری دانیشــتنەکەی و، ســفرەی نــان خواردنەکەی و، جێگەی نووستنەکەیدا.

چاوی کەسانی دەوروبەری زۆر بە سەرنج و تیژبینبوون، تەنانەت تــاریکیش بەرچــاوی دڵانــی ئەوینــداری پێغەمبــەری نــەدەگرت، کــە دەیانویست بزانن ئــەو پێغەمبــەرەﷺ چۆن شــەو دەکاتــەوە، بگــرە دیوارەکــانیش هێنــدە باڵانــەبوون ژیــانی تایبــەتی ئــەو بپۆشــن، دڵ و چاوی هەمووان هەمیشە هاودەمی بوون و، تــا دەچــووە نــاو جێگــەی نووستنەکەی، لە دەمی شیرین خەو و، لە ناو جلی نوستن و، هەستان لە خەویدا سەرنجیان دەدا.

بــەهۆی گورجوگۆڵیــەوە وا هەستت دەکــرد هــەموو ســاتێك تــازە دەست پێدەکات، ئەو پیاوی هەڵوێست و هــەلوەرگرتن بــوو، بــە پێــی



سروشتی پێغەمبەرێتی تێدەگەیشت کە هەموو خولەکێك و هەموو ڕۆژێکی لەسەری ئەژمار دەکرێت و پێویستە مافی بدات، ئەجەلیش لە نزیك ساتەکانی تەمەنیەوە خێوەتی هەڵداوە...

لەم چەند لاپەڕەیەدا، هاوڕێنی بەیانیان و ئێوارانی پێغەمبەر ﷺ دەبین، نانی دەستی دەخۆین، وەك مامۆستا گوێ لە دەنگە بەسۆزەکەی دەگرین و، وەك نوێژخوێنیش گوێبیستی ورتە نزمەکانی دەبین لەکاتی نوێژدا، لەسەر ئەو حەسیرە سادەیە دادەنیشین کە خۆی هەمیشە لەسەری دادەنیشت، لەو خواردنە کەمەی دەخۆین کە دەیبەخشی..

لەڕاستیدا تۆش دەتوانیت بڕۆیتە ماڵە سادەکەیەوە و، بە پێی وتەو وەسف و گێڕانەوەی هاوەڵان لە بارەیەوە، دەکرێ بە نووستوویی بیبینیت، هەروەها دەتوانی کۆرپەیەك بخەیتە ئامێزییەوە و، منداڵێك بە کۆڵیدا بدەیت، بۆ ئەوەی بە گەرموگوڕی و میهرەبانییەکەی بەرەکەتدار بیت.

کەواتە ئەو مرۆڤە مەزنە و، پێغەمبەرە ڕێزدارە، چۆن مامەڵەی دەکرد لەگەڵ سروشتی مرۆیی خۆی و، پرۆژە پەیامدارەکەیدا؟

چۆن لەگەڵ خولی بیستوچوار کاتژمێری ڕۆژانەیدا مامەڵەی دەکرد؟ و چۆن بەسەری دەبرد؟



ئـەم پەرتووكـەی بەردەسـتت نەخشـەی وردەكارییـەكانی ڕۆژی: پێغەمبـەرێك، نێردراوێكـی خـودا، مرۆڤێـك، بەرپرسـێك، باوكێـك، هاوسەرێك، هاوڕێیەكە...

ئەمە ڕۆژانەی پێغەمبەرێتییە....

عبدالوهاب ناصر الطريري

شاری مەككەی پیرۆز

١٤٣١/٧/٢٠ كۆچی







# ڕۆشنایی سپێدە



ڕۆشنایی سپێدە تاریکی شەوگاری لەت کرد، بانگی بیلالیش –ڕەزای خوای لێ بێت– بێدەنگی مەدینەی شکاند، ئەمە لەکاتی شیرین خەوی پێغەمبەردا بووﷺ، بۆ ئەوەی جەستەی پیرۆزی لە کاتی بەرەبەیاندا بحەوێتەوە، پاش زۆریادکردنی خودا لە هەستانی شەوگاردا.

کاتێك بیلال –ڕەزای خوای لێ بێت– بانگی دەدا، پێغەمبەرﷺ لەخەوهەڵدەستا و، یەکەم شتێك ئەنجامی دەدا سیواکەکەی هەڵدەگرت و سیواکی دەکرد[1]، پاشان دەیفەرموو: " **الحمد لله الذي أحيانا بعدما أماتنا ، وإليه النشور**".

**واتە: "سوپاس بۆ ئەو خودایەی زیندووی کردینەوە پاش ئەوەی مراندینی، گەڕانەوەش تەنها بۆ لای ئەوە".**[2]

پاشان وەڵامی بانگدەرەکەی دەدایەوە وەك خۆی، کاتێ بیوتایە: الله أکبر، دەیفەرموو: "**الله أکبر**"، ئەگەر بیوتایە: أشهد أن لا الـه إلا

---

١- صحیح البخاري، رقم الحدیث: ٢٤٦. مسلم: ٢٥٥، ٧٤٦

٢- صحیح البخاري، رقم الحدیث: ٦٣١٢. مسلم: ٢٧١١



الله، دەیفەرموو: **"أشهد أن لا اله إلا الله"**، ئەگەر بیوتایە: وأشهد أن محمداً رسول الله، دەیفەرموو: **"وأشهد أن محمداً رسول الله"**، ئەگەر بیوتایە: حي على الصلاة، دەیفەرموو: **"لاحول ولا قوة الا بالله"**، ئەگەر بیوتایە: حي على الفلاح، دەیفەرموو: **"لاحول ولاقوة إلا بالله"**، ئەگەر بیوتایە: الله أكبر الله أكبر، دەیفەرموو: **"الله أكبر الله أكبر"**، ئەگەر بیوتایە: لاإله الا الله، دەیفەرموو: **"لااله الا الله"**[١].

پاشان هەڵدەستا، ئەگەر پێویستی بەخۆشۆردن بوایە، خۆی دەشوشت و، ئەگەر پێویستیشی بکردایە دەستنوێژیشی دەگرت.

لەوانەبوو هەندێ جار بێ دەستنوێژگرتنەوە هەستایە بۆ نوێژ، کاتێك لەمەشدا پرسیاری لێدەکرا، دەیفەرموو: **"چاوم لێکدەنێم، بەڵام دڵم ناخەوێت"**.[٢]

پاشان دوو ڕکات نوێژی بەیانی دەکرد، نوێژێکی کورت بوو، تا دەگەیشتە ئەوەی کەسێك بڵێت: تۆ بڵێی فاتیحەی خوێندبێت؟[٣]

لەو نوێژەدا پاش (فاتیحە) لەڕکاتی یەکەمدا (قل يأيها الكافرون)ی دەخوێند، لە ڕکاتی دووەمیشدا (قل هو الله أحد)ی دەخوێند، هەندێ جاریش لە ڕکاتی یەکەمدا ﴿قولُوا آمَنَّا بِاللّهِ وَمَا

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٩١٤.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١١٤٧،٢٠١٣،٣٥٦٩. مسلم: ٧٦٣

٣- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦١٨، ٦١٩، ١١٧١. مسلم: ٧٢٣-٧٢٥، ٧٣٦

أُنزِلَ إِلَيْنَا .... ﴾[1] ی دەخوێند و، لە ڕکاتی دووەمیشدا: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ .....﴾[2] ی دەخوێند.[3]

کاتێك لە نوێژەکەی دەبووەوە، ئەگەر هاوسەرەکەی بێداربوایە قسەوباسی خۆش و دڵنەوایی لەگەڵدا دەکرد. تۆ چی دەڵێیت بەرامبەر هاوسەرێکی خۆشەویست کە بەرەبەیانی ڕۆژەکەی بەباسی خۆشەویستی لەگەڵ مێردەکەی دەست پێ بکات! ئەگەر هاوسەرەکەی لە خەودا بوایە، لەسەر شانی ڕاستی رادەکشا هەتا کاتی نوێژی جەماعەت دەهات.[4]

هەر کە بیلال –ڕەزای خوای لێ بێت– بیبینیایە، وا خەڵك لە مزگەوتەکە کۆبوونەتەوە بۆ نوێژ، دەچووە خزمەتی و بانگی دەکرد: "کاتی نوێژە، پێغەمبەری خوا"[5]، جا پێغەمبەرﷺ دەڕۆیشتە ناویان، کە لەماڵ دەردەچوو، نیگای بۆ ئاسمان بەرزدەکردەوە و دەیفەرموو: "بسم الله، توكلت على الله، اللهمَّ إني أعوذُ بك أنْ أضِلَّ أو أُضَلَّ، أو أزِلَّ أو أُزَلَّ، أو أظلِمَ أو أُظلَمَ، أو أجهَلَ أو يُجهَلَ عَلَيَّ"

---

١ - البقرة:١٣٦

٢ - آل عمران:٦٤

٣- مسلم، رقم الحديث: ٧٢٦، ٧٢٧

٤- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١١٦٨، ١١٦١. مسلم: ٧٤٣

٥- مسند أحمد، رقم الحديث: ٢٥٧٢. سنن النسائي: ٦٨٦

واتە: "بەناوی خوداوە، پشتم بە خودا بەست، خودایە من پەنا دەگرم بە تۆ کە سەر لەکەس بشێوێنم یان کەسێك سەرم لێ بشێوێنێت، یان هەڵە بکەم یان هەڵم پێ بکرێت، یان ستەم بکەم یان ستەمم لێ بکرێت، یان نەزان بم یان نەزانیم بەرامبەر بکرێت".[1]

کە دەچووە مزگەوتەوە دەیفەرموو: "بسم الله، و السلامُ على رسول الله، اللهمَّ اغفرْ لي ذنوبي، وافتحْ لي أبواب رحمتك، أعوذ بالله العظيم، وبوجهه الكريم، وبسلطانه القديم، من الشيطان الرَّجِيم"

واتە: "بەناوی خودا، سڵاو لە نێردراوی خودا، خودایە لە گوناهەکانم خۆشبە و، دەروازەکانی بەزەیی خۆتم بۆ واڵابکە، پەنا دەگرم بە خوای گەورە و بەڕووی شکۆداری و بە دەسەڵاتی هەرە دێرینەی، لە شەیتانی نەفرەتی".[2]

کە بیلال دەیبینی وا پێغەمبەرﷺ هاتە ناو مزگەوتەوە، قامەتی دەکرد بۆ نوێژ[3]، کە هاوەڵانیش ئەویان ببینیایە خێرا هەڵدەستان بۆ نوێژ.[4]

هەندێ جار کە دەردەچوو، دڵۆپی تەڕایی شۆردنی سەری دەچۆڕا، هەندێ جاریش کە لە شوێنی نوێژەکەیدا دەوەستا، بیری

١- مسند أحمد، رقم الحديث: (٢٦٧٢٩،٢٦٧٠٤،٢٦٦١٦). سنن أبي داود: ٥٠٩٤

٢- مسند أحمد، رقم الحديث: (٢٦٤١٩،٢٦٤١٧،٢٦٤١٦). سنن أبي داود: ٤٦٦

٣- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٦٠٦.

٤- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦٣٨،٩٠٩،٦٣٧. مسلم: ٦٠٤



دەکەوتەوە کە هێشتا لەشی گرانە و خۆی نەشۆردوە، پێی دەفەرموون: **"لە شوێنی خۆتان بن"**، پاشان دەگەڕایەوە ماڵەوە، خۆی دەشۆرد و، دەگەڕایەوە لایان لەکاتێکدا هێشتا چۆڕاوی ئاو لەسەری دەتکا.[1]

پێغەمبەر ﷺ ئەم باس و خواسانەی نەدەشاردەوە و شەرمی نەدەکرد لە باسکردنیان، ئەو مرۆڤ بوو وەك هەر مرۆڤێکی تر، خەڵك ژیانی خۆیان لە ژیانی ئەودا دەبینیەوە.

کاتێ لەشوێنی نوێژەکەی هەڵدەستا، بە هاوەڵانی دەفەرموو: **"ڕیزەکانتان ڕێکبخەن و، پاڵبدەن بەیەکەوە، بزانن کە ڕێکی ڕیزەکان تەواوکەری نوێژە"**[2].

پاشان بە(الله أكبر) نوێژی دادەبەست، بێدەنگ دەبوو بە ئەندازەی ئەوەندەی بڵێت: **"اللهمَّ باعد بيني وبين خطاياي، كما باعدتَ بين المشرق والمغرب، اللهمَّ نقّني من خطاياي، كما يُنقّى الثوبُ الأبيضُ من الدَّنَسِ، اللهمَّ اغسلني من خطاياي بالثلج والماء والبرد"**

واتە: **"خودایە ماوەی نێوان من و گوناهەکانم دووربخەرەوە، وەك چۆن نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوات دوورخستۆتەوە، خودایە لە**

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٩٣٩. صحيح مسلم: ٦٠٥

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٧١٩. صحيح مسلم: ٤٣٣



**گوناهەکانم پاکم کەرەوە، هەروەکو چۆن جلێکی سپی لە پیسی پاکدەکەیتەوە، خودایە گوناهەکانم بشۆ بە بەفر و ئاو و تەرزە"[1].**

پاشان بەدەنگی بەرز فاتیحەی دەخوێند، خوێندنەوەیەکی وردی بەدوای یەکدا، ئایەتەکانی بەش بەش دەخوێندەوە: ( الحمدلله رب العالمين) پاشان دەوەستا..(الرحمن الرحيم)....پاشان دەوەستا، (مالك يوم الدين) پاشان دەوەستا، خوێندنەوەکەی درێژ دەکردەوە، وشەی (الرحمن)ی درێژ دەکردەوە[2]، کە لە نوێژی بەیانیدا قورئانی دەخوێند درێژی دەکردەوە، لە نوێژەکەیدا لەنێوان شەست تا سەد ئایەتی دەخوێندەوە[3]، خۆ ئەگەر ڕۆژی هەینی بووایە، لەڕکاتی یەکەمدا: ﴿الم (١) تَنزِيلُ الْكِتَابِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ الْعَالَمِينَ﴾ی سورەتی (السجدة)ی دەخوێند و، لە ڕکاتی دووەمیشدا: ﴿ هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا(١)﴾ی سورەتی (الإنسان)ی دەخوێند.[4]

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٧٤٤. صحيح مسلم: ٥٩٨

٢- مسند أحمد، رقم الحديث: ٢٦٥٨٣. سنن أبي داود: ٤٠٠١

٣- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٤١، ٥٩٩. صحيح مسلم: ٤٦١،٦٤٧

٤- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٨٩١،١٠٦٨. صحيح مسلم: ٨٧٩،٨٨٠



هەندێ جار پاش کڕنوشی دووەم و لە دابارینی نەهامەتیەکاندا نزای قنوتیشی دەخوێند، دەست بە دوعا داوای ڕزگاری و سەرکەوتنی لە خوا دەکرد.[1]

کە نوێژەکەی تەواو دەکرد و، سڵاوی دەدایەوە لە شوێنی خۆیدا ڕووبەڕووی (کەعبە) دەیفەرموو: **"أستغفرُ الله، أستغفرُ الله، أستغفرُ الله، اللهمَّ أنتَ السلامُ، ومنك السلامُ، تباركتَ يا ذا الجلال و الإكرام"**

واتە: **"خودایە داوای لێ خۆشبوون دەکەم، خودایە داوای لێ خۆشبوون دەکەم، خودایە داوای لێ خۆشبوون دەکەم، خودایە خۆت ئاشتیت و، ئاشتی لە تۆوەیە، پایەداربیت خاوەن گەورەیی و شکۆ"**.[2]

پاشان بەلای ڕاستیدا هەڵدەستا، هەندێ جاریش بەلای چەپیدا، یەکەم وشەیەك هاوەڵەکانی گوێیان لێدەبوو کاتێ ڕووی تێدەکردن دەیفەرموو: **"ربِّ قِني عذابَكَ يومَ تبعثُ عبادَك"** واتە: **"پەروەردگارم کاتێك بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە لە ئەشکەنجەی خۆت بمپارێزە"**.[3]

پاشان دەیفەرموو: **"لا إله إلا الله، وحده لا شريك له، له الملك، وله الحمد، وهو على كل شيء قدير، لا حول ولا قوة إلا بالله، لا إله إلا الله، ولا نعبدُ إلا إيَّاه، له النعمةُ، وله الفضلُ، وله الثناءُ الحسنُ، لا إله**

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٤٥٦٠،٦٣٩٤. صحيح مسلم: ٦٧٧،٦٧٨

٢- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٥٩١،٥٩٢.

٣- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٨٥٢. صحيح مسلم: ٧٠٧،٧٠٩



إلا الله، مخلصين له الدينَ، ولو كره الكافرون، اللهمَّ لا مانع لما أعطيتَ، ولا مُعْطِيَ لما منعتَ، ولا ينفعُ ذا الجَدِّ منك الجَدُّ "

واتە: "جگە لە (الله) خودایەکی تر نیە، تاقانەیە بێ هاوتایە، خاوەندارێتی تەنها بۆ ئەوە، سوپاس تەنها بۆ ئەوە، کە توانای دەشکێ بەسەر هەموو شتێکدا، هیچ پشت و پەنایەك نیە جگە لە خودا (لاإله الا الله) جگە لەو کەس ناپەرستین، خۆشنازیی هی ئەوە، چاکە هی ئەوە، پیاهەڵدانی چاك هەر بۆ خۆیەتی، ملکەچین بۆ ئەو لە خواپەرستییەکەماندا، با بێ باوەڕانیش پێی قەڵس بن، خودایە هیچ ڕێگرێك نیە لە بەخشینی تۆ، هیچ بەخشندەیەکیش نیە بەڕێگرتنی تۆ، هیچ دەوڵەمەندێك لە پاڵ دەوڵەمەندی تۆدا سوودی نابێت." [١] پاشان دەیفەرموو: "(سبحان الله)، (الحمد لله)، (الله أكبر)". [٢] پاشان باسی خودای بە چڕوپڕترین یاد دەکرد، بەو شێوازەی پێشوازی لەبەرەبەیانی ئەو ڕۆژەی دەکرد، بۆ نموونە:

"أصبحنا وأصبحَ الملك لله، والحمدُ لله، ولا إلـهَ إلا الله، وحدَهُ لا شريكَ له، لهُ الملكُ، وله الحمدُ، وهو على كلِّ شيءٍ قديرٌ، ربِّ أسألُك خيرَ ما في هذا اليوم، وخيرَ ما بعدَه، وأعوذُ بك من شرِّ ما في هذا اليوم، وشرِّ ما بعدَه، ربِّ أعوذُ بك مِن الكَسَلِ، وسوءِ الكِبَر، ربِّ أعوذُ بكَ مِن عَذابٍ في النَّارِ، وعذابٍ في القَبرِ".

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٨٤٤. صحيح مسلم: ٥٩٣

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٨٤٣،٦٣٢٩. صحيح مسلم: ٥٩٥-٥٩٧



واتە: "ڕۆژمان کردەوە، خاوەندارێتی هی خودایە، سوپاس بۆ ئەو خودایە، (لااله الا الله) تاقانەیە و هاوبەشی نیە، موڵك تەنها بۆ ئەوە، سوپاس تەنها بۆ ئەوە، ئەو توانای دەشکێ بەسەر هەموو شتێکدا پەروەردگارم، داوای خێروبێری ئەم ڕۆژەت لێ دەکەم، هەروەها خێروبێری سبەینێش، پەنا دەگرم لە تەمبەڵی، لە تەنگوزلی، پەروەردگارم پەنا دەگرم بە تۆ لە ئەشکەنجەی ئاگر و گۆڕ" کە ئێوارەی بەسەردا دەهات هەمان نزای دووبارە دەکردەوە لە جیاتی (اصبحنا)، (أمسینا)ی دەفەرموو.[1]

" اللهمَّ إنّي أسألُكَ العافيةَ في الدُّنيا والآخرة، اللهمَّ أسألُك العفوَ والعافيةَ في ديني ودُنيايَ، وأهلي ومالي، اللهمَّ استُرْ عَوْراتي، وآمِن رَوْعاتي، اللهمَّ احفَظْني من بين يَديَّ ومن خَلْفي، وعن يميني، وعن شمالي، ومن فَوْقي، وأعوذُ بعظَمتِكَ أنْ أُغْتالَ من تَحْتي"

واتە: "خودایە داوای بێ وەیی دونیا و ڕۆژی دواییت لێدەکەم، خودایە داوای لێخۆشبوون و بێوەیت لێدەکەم، لە دونیا و دینمدا، لەکەسوکار و ماڵ و سامانمدا، خودایە خەوشەکانم داپۆشە، دڵم دامرکێنەرەوە، خودایە بم پارێزە لە پێش و پاشەوەمدا، لە ڕاست و چەپمدا، لەسەرەوەمدا، پەنا دەگرم بە گەورەیی تۆ کە ژێرەو ژوورم بکەیت." بەیانیان و ئێواران وازی لەم نزایە نەدەهێنا.[2]

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٧٢٣.

٢- مسند أحمد، رقم الحديث: ٤٧٨٥. سنن أبي داود: ٥٠٧٤



**"اللهمَّ عافِني في بَدَني، اللهمَّ عافِني في سَمعي، اللهمَّ عافِني في بصَري، لا إلهَ إلا أنتَ، اللهمَّ إني أعوذُ بك منَ الكفرِ والفقر، اللهمَّ إني أعوذُ بك من عذاب القبر، لا إلهَ إلا أنتَ".**

**واتە: "خودایە جەستەم ساغ و بێ وەی کە، خودایە بیستنم ساغ و بێوەی کە، خودایە بینینم ساغ و بێ وەی کە (لااله الا أنت)، خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لە بێ باوەڕی و هەژاری، خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لە ئەشکەنجەی گۆڕ، (لااله الا انت)". بەیانیان و ئێواران سێ جار ئەمەی دەوتەوە.[1]**

**زۆرترین جار داوای لێ خۆشبوونی دەکرد، هەموو بەیانیەک سەد جار داوای لێ خۆشبوونی لە خودا دەکرد.[2]**

**لەو کاتانەدا، خزمەتگوزارانی مەدینە دەهاتنە خزمەتی، جامۆڵکەی ئاویان پێ بوو، داوایان لە پێغەمبەر دەکرد ﷺ بۆ پیرۆزی پەنجەی بخاتە نێو جامۆڵکەکانیانەوە، هیچ جامۆڵکەیەکی نەدەهاتە بەردەست پەنجەی تێ نەکردایە.**

**هەندێ جار لە ڕۆژانی زۆر ساردیشدا دەهاتنە خزمەتی و پەنجەی دەخستە نێو جامۆڵکەکانیان.[3]**

---

١- مسند أحمد، رقم الحديث: ٢٠٤٣٠. سنن أبي داود: ٥٠٩٠

٢- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٧٠٢.

٣- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٣٢٤.



# بەیانی پێغەمبەرانە



پاشان شانی ڕیزەکان لەیەك نزیك دەبوونەوە، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کەمەربەندیەکیان دەکرد بە چوار دەوریدا و ئەویش لە جێگەی نوێژەکەیدا دادەنیشت و ڕووی تێدەکردن، سپێدەی بەرەبەیان ڕەونەقی جوانی ڕووی پێغەمبەری دەردەخست ﷺ، هەندێ جار ئامۆژگاریەکی دەکردن، هەر وەکو لە باسەکەی عیرباضی کوڕی ساریەدا -ڕەزای خوای لێ بێت- هاتووە، دەڵێ: ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ دوای نوێژی بەیانیی ئامۆژگاریەکی کاریگەری کردین، فرمێسکی لە چاوان هێنا، دڵانی هێنایە لەرزین، پیاوێك وتی: ئەری ئەوە ئامۆژگاری ماڵاواییە، چیمان پێ ڕادەسپێریت پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: **"وەسێتان بۆ دەکەم بەسڵکردن لە خودا، بە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداریی، با میرەکەتان بە ندەیەکی حەبەشیش بێت، ئەگەر کەسێك لە ئێوە زیاتر بژی ڕاجیاوازیی زۆر دەبینێت، خۆتان لادەن لە شت زیادەکردن، ئەوە سەرلێتێکچوونە، ئەگەر کەسێك لە ئێوە**



**گەیشتە ئەو کاتە، با دەست بگرێت بە ڕێبازی من و جێنیشینە دانا و ڕێنوێنەکانی دوای خۆمەوە، بە دانەخرێکانتان بیگرن".**[1]

پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر ئامۆژگاری لەم جۆرەی نەدەکردن، بەڵکو جاروبار ئاشنای دەکردن پێی، بەبێ بێزارکردن.[2]

هەندێ جار دەیدواندن، جارێکیان نوێژی بەیانی کرد، پاشان ڕووی کردە خەڵك و، فەرمووی: **"جارێکیان کابرایەك مانگایەکی دابووە پێش خۆی و باری کردبوو، مانگاکە لایەکی بەلای کابرادا کردەوە و وتی: ئەرێ کابرا من بۆ ئەمە دروست نەکراوم، بەڵکو بۆ سك و سزا؟!"** خەڵکی وتیان: (سبحان الله) -بەترس و سەرسامیەوە- مانگا قسەی لەگەڵدا دەکرێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"من و ئەبوبەکر و عومەر باوەڕمان پێیەتی".**

پاشان فەرمووی: **"شوانێك بەلای مێگەلەکەیەوە بوو گورگ دای بەسەریاندا، مێیەکی برد، شوانەکە ڕای کرد بە دوایدا هەتا لێی سەندەوە، گورگە کە لای کردەوە بەلای شوانەدا وتی: ئەی ئەو کاتەی دڕندەیەك دەدات بەسەریاندا و تەنها من شوانەکەیانم کێ ڕزگاریان دەکات؟!"** خەڵکی وتیان: (سبحان الله)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"من و ئەبوبەکر و عومەر باوەڕمان پێیەتی"**[3].

---

١- مسند أحمد، رقم الحديث: ١٧١٤٥،١٧١٤٤،١٧١٤٢. سنن أبي داود: ٤٦٠٧

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦٨، ٦٤١١. صحيح مسلم: ٢٨٢١

٣- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٣٤٧١، ٣٦٦٣. صحيح مسلم: ٢٣٨٨



لەوکاتەشدا ئەبوبەکر و عومەر لەوێ نەبوون، بەڵام پێغەمبەر ﷺ شایەتیی دا بۆ باوەڕی هەردووکیان لەبەر متمانەی تەواوی پێیان -ڕەزای خوایان لێ بێت-.

جارێکیان هاتە ناو هاوەڵان و، ئەوانیش بەدەوریدا کۆبوونەوە، پێی فەرموون: **"ئایا کەسێکی نەخۆشتان هەیە سەردانی بکەین؟"** ئەگەر بیان وتایە: نا، دەیفەرموو: **"ئەی مردوویەکتان هەیە بڕۆین بە دوای تەرمەکەیدا؟"** ئەگەر بیان وتایە: نا دەیفەرموو: **"کێ لە ئێوە خەونێکی دیوە، با بۆم بگێڕێتەوە، من بۆی لێکدەدەمەوە"**، ئەوانیش خەوەکانیان بۆ دەگێڕایەوە و بۆی لێکدەدانەوە، یان بەویستی خودا شتێکی پێ دەوتن.

**یەکێك لەوانە:**

ڕووداوی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: "لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ خەونێکم بینی، خۆم بینی وەك لە باخچەیەکدا بم وابوو، باسی پان و پۆڕی و سەوزیی باخەکەی کردبوو لەناوەڕاستیدا پایەیەکی ئاسنین چەقێنرابوو بنی لە زەوی و سەری لە ئاسمان بوو، سەرنووکی ئاسنەکە گوریسێ بوو، پێم وترا سەرکەوە، وتم: ناتوانم، خزمەتکارێك هاتە لام جلەکانمی لە پشتەوە بەرزکردەوە، هەتا گەیشتمە ئاستی گوریسەکە و گرتم، پێم وترا، دەستی پێوەبگرە، پاشان کە لەخەو ڕاچڵەکیم، دەبینم هێشتا بەدەستمەوەیە، بۆ پێغەمبەرم گێڕایەوە ﷺ فەرمووی: "ئەو



**باخچەیە: ئیسلامە، پایەکەش پایەی ئیسلامەتیە، ئەو گرێی گوریسەش -گوریسە قایمەکەیە- تۆ بە ئیسلامەتی دەژیت هەتا دەمریت".**[1]

جارێکیان فەرمووی بە هاوەڵەکانی -ڕەزای خوایان لێ بێت-: **"هەرکەسێك لە ئێوە خەونێکی بینی با بیگێڕێتەوە، من بۆی لێکدەدەمەوە".** پیاوێك وتی: پێغەمبەری خودا، من ئەم شەو لە خەونمدا پەڵە هەورێکم بینی دڵۆپی ڕۆن و هەنگوینی دەباراند- سەیرم دەکرد خەڵك لەپی دەستیان ڕوودەکردە ئاسمان- سا هەندێ زۆری بەردەکەوت و هەندێکیش کەم، پارچە گوریسێکم بینی لە ئاسمانەوە بۆ زەوی درێژ بووەبووەوە، تۆم بینی دەستت پێوەگرت و بەرزبوویتەوە، پاش تۆ پیاوێك دەستی پێوەگرت و بەرزبۆیەوە، پاشان پیاوێکی تریش دەستی پێوەگرت بەرزبووەوە، پاشان کەسێکی دیکە دەستی پێوەگرت و پچڕا پاشان بۆی بەسترایەوە.

ئەبوبەکر وتی: پێغەمبەری خوا، دایك و باوکم بە قوربانت بن، لێم گەڕێ با من بۆی لێکبدەمەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"بۆی لێکبدەرەوە".** ئەبوبەکر وتی: پەڵە هەورەکە، پەڵە هەوری ئیسلامە، ئەوەش کە ڕۆن و هەنگوینی لێ دەباری، شیرینی و نەرم و شلی

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٣٨١٣، ٧٠١٤. صحيح مسلم: ٢٤٨٤



قورئانـه، ئـهوەش کـه خـهڵك لـهپی دەسـتیان دابـووە بـەری ئـەوە کەسێکە زۆر لە قورئان وەربگرێت یان کەمی لێ وەربگرێت.

گوریسەکەش کـه لـه ئاسمانـەوە بۆ زەمـین شـۆڕبووەتەوە، ئـەو ڕاستیەیە کە تۆ گرتووتە بەر، کاری پێ دەکەیت، خوداش بە هۆیـەوە بەرزتدەکاتەوە، هـەروەها پیـاوێکی تـری دوای تـۆش بەرزدەبێتـەوە، پاشان پیاوێکی تر دەستی پێوەدەگرێـت و بـەرز دەبێتــەوە، پاشـان پیاوێکی تر دەستی پێوە دەگرێت و بەرز دەبێتەوە و دەپچڕێت و لـە پاشان پێی بەرزدەبێتەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێم بڵـێ ڕاسـتیم پێکا یان بە هەڵەدا چووم (دایك و باوکم بـەقوربانت بـن)؟ فـەرمووی: **"هەندێکیت پێکا و هەندێکیشت هەڵـە کـرد"**، وتم: پێغەمبـەری خـوا ﷺ بەخوا دەبێ پێم بڵێیت لە چیدا هەڵەم کرد؟ فەرمووی: **"سـوێند مەخۆ"**.[1]

تێبینی دەکرێ ئـەو خەونانـەی هـاوەڵانی پێغەمبـەر ﷺ دەیـان گێڕایەوە بۆی بریتی بوون لە خەمی هەرە گەورە و پرسـی یەکـەمیان کە ئایین و پێغەمبەر بوو، ئەوان ڕۆژانە لە گەڵیدا دەژیان زەحمـەتیان بۆ دەکێشا لە بێداری و خەونەکانیشیدا، ئای خودایە! ئەمانە چ دڵ و دەروونێکن ئەڵقـەی دەوری پێغەمبـەریان داوە، خەمـەکانیان بـۆ ئـەو شۆڕ دەبێتەوە بۆ بێداری و نوستن تەنانەت خەونەکانیشیان.

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٧٠٤٦. صحيح مسلم: ٢٢٦٩



هەندێ جار پێغەمبەر ﷺ باسی خەونێکی خۆی بۆ دەگێڕانەوە و مانای دەکرد بۆیان -ڕەزای خوای لێ بێت- هەروەکو لە فەرموودەکەی (سەمرە)دا دیارە -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێ: ڕۆژێکیان پرسیاری لێ کردین: **"کەسێك لە ئێوە خەونێکی دیوە؟"** وتمان: نەخێر، فەرمووی: **"من ئەمشەو لە خەونمدا دوو پیاو هاتنە لام، دەستیان گرتم، بردمیان بۆ خاکە پیرۆزەکە"**. -پاشان باسی خەونە درێژەکەی کرد-، تیایدا باسی ژیانی ئەشکەنجەدراوەکانی کرد و، لەسەر چی ئەشکەنجە دەدرێن، هەروەها باسی هەندێ لە بارودۆخی ڕۆژی دوایی کرد.[1]

هاوەڵان لەو دانیشتنەدا قسەوباسیان دەکرد لە خزمەتیدا ﷺ، ئەویش ئاڵوگۆڕی قسەی لەگەڵ دەکردن، هەندێ جاریش باسی سەردەمی نەفامیی خۆیان دەکرد، کە چۆن کاری نەزانانە و سەرکەشانەیان دەکرد و، ئابڕوی خۆیان دەبرد، پاشان چۆن خودا بەهۆی پێغەمبەرەوە ﷺ ئیسلامەتی بۆ ناردن، کە باسیان دەکرد تێر پێدەکەنین بە ڕۆژانی نەفامیی خۆیان، پێغەمبەریش ﷺ زەردەخەنەیەکی دەکرد، ئەو کە پێکەنینەکەی هەمیشە زەردەخەنە بوو، لە شوێنی خۆی دەمایەوە هەتا خۆر بە جوانی دەردەکەوت.[2]

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١٣٨٦. صحيح مسلم: ٢٢٧٥

٢- صحيح مسلم، رقم الحديث:٦٧٠، ٢٣٢٢.



پاشان دەڕۆشت بۆ ژووری هاوسـەرەکانی، کـە دەچـووە مالـەوە دەیفەرموو: **"اللهمَّ إني أسألُكَ خـيرَ المَـولَجِ، وخـيرَ المَخـرَجِ، بسـم الله وَلَجْنا، وبسم الله خَرَجْنا، وعلى الله ربِّنا توكَّلنا"**

واتـە: **"خودایـە مـن داوای خێـری ئـەم چـوونەژوورەوەیەت لـێ دەکەم، هەروەها خێری هاتنەدەرەوەشی، بە ناوی خوداوە چووینە ژوورەوە و بـە نـاوی خـوداوە هاتینـەدەرەوە و، تـەنها پشـتمان بـە خودای پەروەردگاری خۆمان بەست"**. [1]

یەکەمین شتێك دەستی بۆ دەبرد لەکاتی چوونەژوورەوەیدا بۆ ماڵەکـەی، سـیواکەکەی بـوو، ددانـی بێگـەردی پـێ پاکـدەکردەوە و، سڵاوی دەکرد و دەیفەرموو: **"سڵاوتان لێ بێت، خەڵکی ماڵەکە ئێوە چۆنن؟"**

پاشـان دەچـووە لای خێزانـەکانی، هـەر کـە دەچـووە ژووری یـەکێکیان، سـڵاوی لـێ دەکـردن و، نـزای بـۆ دەکـردن و زۆر لایـان نەدەمایەوە. [2]

هەندێ جار کە دەچووە لای یەکێکیان لە کاتی نوێژدا بوو، بۆیـە بەو شێوازە جێی دەهێلا و دەهاتەدەرەوە، هەروەکو چۆن چووە لای

---

١- أبي داود، رقم الحديث: ٤٤٥٣

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث:٤٧٩٤. صحيح مسلم: ٢٥٣، ١٤٢٨.



جوەیریەی هاوسەری لەکاتێکدا لەسەر بەرماڵەکەی نزای دەکرد، هەروا بەجێی هێشت و نزاکەی لێ تێکنەدا.[1]

لەوانە بوو داوای خواردنێکی بکردایە، کاتێك دەیفەرموو: **"ئەرێ هیچتان لە لایە؟"** ئەگەر خواردنێك هەبووایە بۆی دەهێنرایە پێشەوە، زۆر جار خواردنێکی سوکەڵە بوو وەك خورما و ڕۆن و کەشك، یان خواردنەوەیەك بوو وەك ماستاو و ئاوی ترێ و شتێکی لەو شێوەیە، هەندێ جار داوای خواردنی دەکرد، ئەوان دەیان وت: پێغەمبەری خوا هیچمان نیە، دەیفەرموو: **"منیش بەڕۆژووم"**.[2]



---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٧٢٦.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١٤٩٤. صحيح مسلم: ١٠٧٦، ١١٥٤.



# دیوەخانی پێغەمبەرانە



کە پێغەمبەرﷺ سەردانی هاوسەرەکانی تەواو دەکرد، دەگەڕایەوە بۆ مزگەوت، کە دەچووە ژوورەوە نوێژی (تحیة المسجد) واتە سڵاوی مزگەوتی دەکرد لە پاڵ پایەیەکدا پێی دەگوترا پایەی کۆچکەران، دەکەوێتە ناوەڕاستی (روضە)ی پیرۆزەوە، هەمیشە دەگەڕا تا لەو جێگەیەدا نوێژەکەی دەکرد.[1]

پاشان لەبەشی ڕۆژهەڵاتی مزگەوتەکە و ڕەوزەی پیرۆزەوە دادەنیشت و، پاڵی دەدا بە ژوورەکەی عائیشەوە -ڕەزای خوای لێ بێت- و، هاوەڵان لە گەڵیدا کۆدەبوونەوە، ئەمە نەریتێکی ڕۆژانەی بوو، بەشێوەیەك هەرکەسێك بیویستایە لەو کاتەدا پێغەمبەرﷺ ببینێت، دەهاتە لای بۆ مزگەوت، ژمارەی هاوەڵانیش لەوێدا هەندێ جار زۆر و هەندێ جاریش کەمبوون، بە پێی کاتی دەستبەتاڵی و بارودۆخی گوزەرانیانەوە، ئەگەر کەمبوونایە ئەڵقەیان دەبەست بەدەوریدا ئەگەر زۆریش بوونایە بەدوو ڕیز لە هەردوو لاتەنیشتەوە

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٠٢. صحيح مسلم: ٥٠٩



دادەنیشتن، تا کەسێکی دەرەوە دەهات و پرسیارکەریش بە تەواوی لێی نزیک دەبووەوە.[1]

کاتێك دادەنیشت لەگەڵ هاوەڵانیدا قسەی لەگەڵ دەکردن، لە هەمو دروستکراوێکی تری خودا ڕەوانبێژتر و وتەشیرینتر و، قسەڕوونتر بوو، وتەکانی نە خێرا بوون، نە خاو و لێکپچڕاو، بەڵکو ڕستەکانی نێوەبەندی هەبوو، ئەگەر کەسێك بیویستایە دەیتوانی وشەکانی بژمێرێت، هەروەکو (عائیشە) ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ وەك ئەم شێوازەی ئێوە قسەی نەدەکرد، بەڵکو بەڕوونی و وشە وشە قسەی دەکرد، هاونشینەکەی دەیتوانی قسەکانی لەبەربکات.[2]

زۆرجاری قسەکانی شێوازی پرسیاری وەردەگرت: هەندێ جار پرسیارێکی دەکرد بۆ ئەوەی پرسیاری لێ بکەن، وەك ئەوەی فەرموویەتی: **"ئەرێ هەواڵی گەورەترین گوناهتان پێ بڵێم؟"** وتیان: بەڵێ پێغەمبەری خوا، فەرمووی: **"هاوەڵدانان بۆ خودا، ئازاری دایك و باوك، شایەتی درۆ".**[3]

لەوانەیە پرسیارەکەی بۆ سەرنج ڕاکێشانی ئەوانە بوبێت بەرەو مانایەکی گەورەتر لەوەی لە ناخی پرسیارەکەدایە، بۆ نموونە

---

١- سنن أبي داود، رقم الحديث: ٤٦٩٨.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٣٥٦٨. صحيح مسلم: ٢٤٩٣

٣- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٢٦٥٤، ٥٩٧٦. صحيح مسلم: ٨٧



فەرموویەتی: "ئایا دەزانن کێ نابووتە؟" وتیان: لای ئێمە نابووت ئەو کەسەیە کە نە پارەو پولی هەیە و نە شمەك، فەرمووی: "نابووتی ناو میللەتی من ئەو کەسەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا نوێژ و ڕۆژ و زەکاتی هەیە، بەڵام جنێوی بەوە داوە و، بوختانی بۆ ئەوی تر کردوە و، ماڵی ئەوی تریشی خواردووە و، خوێنی ئەویشی ڕشتووە و، لەوی تریشی داوە، بۆیە چاکەیەکی دەدرێ بە یەکێك و چاکەیەکی دیکەی دەدرێ بەکەسێکی تر، چاکەی نامێنێت پێش ئەوەی دادی لەگەڵدا بکرێت، لە خراپەی کەسەکانی دیکە دەهێنرێت و دەدرێت بە کۆڵی ئەودا، پاشان فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە".[1]

لەوانەبوو زەینیان بوروژێنێ بە پرسیارێك، تا وەڵامی بدەنەوە، هەروەکو چۆن پرسیارێکی ئاڕاستەکردن و فەرمووی: "ئادەی چڵەدارخورمایەکم بۆ بهێنن"، پاشان فەرمووی: "ناوی درەختێکم پێ بڵێن کە لە مرۆڤی موسوڵمان بچێت، گەڵاکانی نەوەرێت، هەموو کاتێ بەروبوومی هەبێت؟" ناوی زۆرێك لە درەختەکانی دەشت و هەردەکانیان پێوت، پێغەمبەرﷺ هەموو جارێ نەخێری دەکرد، عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب –ڕەزای خوای لێ بێت– شتێکی بە دڵدا هات، –ئەو کاتە منداڵ بوو تەمەنی دەساڵان بوو– لەبەرخۆیەوە وتی: داری خورمایە، ئەنجا سەیرێکی کرد، ئەبوبەکر و عومەر لە دیوەخانەکەدا بوون، لەشەرمی ئەوان ڕووی نەبوو قسەکە

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٥٨١.



بەدەنگی بەرز بکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەو درەختە داری خورمایە".** [1]

هەندێ جار فەرمایشتەکانی سێ جار دەوتەوە، بۆ ئەوەی پەندی لێ وەربگیرێت یان گرنگیەکەی دەربخات، یان لەوانەیە بۆ گرنگیدانی زۆری بوبێت، وەکو ئەو فەرمایشتەی فەرموویەتی لەبارەی گوناهە گەورەکانەوە: **"ئای لە شایەتی درۆ، ئای لە شایەتی درۆ"**، هاوەڵان دەڵێن بەردەوام دەیوتەوە، هەتا وتمان بریا بێدەنگ بوایە.

هەندێ جار بە پرسیارێکی لەناکاو دەستی پێ دەکرد بۆ ئەوەی سەربکێشێت بۆ دەرەنجامێکی چاوەڕوان نەکراو، هەروەکو چۆن جارێکیان پرسیارێکی کرد و، فەرمووی: **"کێ ئەمڕۆ لە ئێوە بەڕۆژووە؟"** پرسیارەکە لەناکاو بوو، چونکە خۆیان بۆ وەڵامەکەی سازنەکردبوو، خۆ ئەگەر بیانزانیایە ئەم پرسیارەیان لێ دەکات هەموویان بە ڕۆژوودەبوون، بۆیە بێدەنگ بوون، ئەبوبەکر وەڵامی دایەوە وتی: من بە ڕۆژووم ئەی پێغەمبەری خودا، ﷺ فەرمووی: **"کێ لە ئێوە ئەمڕۆ نەخۆشێکی بەسەرکردۆتەوە؟"** بێدەنگ بوون، ئەبوبەکر وەڵامی دایەوە: من، پێغەمبەری خودا ﷺ، فەرمووی: **"کێ لە ئێوە ئەمڕۆ لەگەڵ تەرمێکدا چووەتە سەرگۆڕستان؟"**، بێدەنگ بوون، دیسان ئەبوبەکر وتی: من، پێغەمبەری خودا ﷺ،

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦١، ٢٢٠٩، ٥٤٤٤. صحيح مسلم: ٢٨١١.

پاشان فەرمووی: **"کێ لەئێوە ئەمڕۆ نانی بە هەژارێك داوە؟"** دیسان هەمووان بێدەنگ بوون، بەڵام ئەبوبەکر وتی: من پێغەمبەری خودا ﷺ، فەرمووی: **"ئەم چوار خەسڵەتە لە هەر کەسێکدا کۆبنەوە خاوەنەکەیان دەخەنە بەهەشتەوە"**.[1]

هەندێ جاریش شێوازێکی ڕوونکردنەوەی بەکاردەهێنا لەکاتی قسەکردندا، هەروەکو چۆن جارێکیان قسەی کرد لەبارەی سپاردەپارێزیەوە، فەرمووی: **"جاری وا هەیە مرۆڤ دەخەوێت، سپاردەی دڵی هەڵدەگرێتەوە، ئاسەوارەکەی وەك خاڵی ڕەش بەجێ دەمێنێت، پاشان دەخەوێتەوە، سپاردەی دڵی دیسان هەڵدەگرێتەوە، ئەوجا ئاسەوارەکەی وەك خەتی پاشماوەی کار لەسەر لەپی دەست دەمێنێتەوە، وەك پشکۆیەك گلۆر بوویێتەوە بۆ ژێر پێت و بیکاتە بلۆق، وا دەزانی ئاوی تێزاوە کە چی هیچی تێدا نییە"**. پاشان وردە بەردێکی هەڵگرت و بەسەر پێیدا گلۆری کردەوە.[2]

هەندێ جار پەنای دەبردە بەر هێلکاری ڕوونکردنەوە، هەروەکو جارێکیان هێڵێکی چوارگۆشەی لەسەر زەوی کێشا، پاشان لە ناوەڕاستی چوارگۆشەکەوە هێڵێکی تری بۆ دەرەوەی چوارگۆشەکە کێشا، پاشان چەند هێڵێکی بچکۆلەی کێشا بە چواردەوری ئەم

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ١٠٢٨.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦٤٩٧، ٧٠٨٦. صحيح مسلم: ١٤٣



هێڵەدەرچووە لە ناوەڕاستی چوارگۆشەکەوە، پاشان فەرمووی: "ئەوە مرۆڤە، ئەوەش وادەی مەرگیەتی بە چواردەوریدا، ئەو هێڵەی دەرەوەش هیواکەیەتی، هەمیشە چاو لە دووی هیواکانیەتی، وادەی مەرگیش بێگومان لێی نزیك دەبێتەوە، ئەو هێڵە وردانەش دەرد و بەلان، ئەگەر ئەوەیانی بەرنەکەوێت ئەوی تریان پێوەی دەدات، ئەگەر ئەوەشیان هەڵەی کرد ئەوی تر پێوەی دەدات". [١]

ئەو دیوەخانەی پێغەمبەر ﷺ دیوەخانی زانست و ئامۆژگاری بوو، ئامۆژگاریی و پرۆسەی فێرکردن لەوێدا بەشێوازی پێوتنەوەی تاك لایەنە نەبوو، بەڵکو شێوازی گفتوگۆ و بەشداری پێکردنی فێرکاری لە خۆگرتبوو، گفتوگۆیەك ڕەچاوکرا کە ڕێگەی دەدا بە گەشەی عەقڵ و بیری فێرکار.

ئەوەی کە تەمەنی ئەو دیوەخانەی درێژترکردبووەوە، زۆر وتنی (أستغفر الله) بوو، هاوەڵان سەرنجیان دەدا کە پێغەمبەر ﷺ لە گوتنی (أستغفر الله) و تۆبەکردن وەڕس نەدەبوو، هەندێ جار لە یەك دانیشتندا پێش ئەوەی هەستێ سەد جار ئەم دوعایەیان بۆ دەژمارد کە دەیفەرموو: "ربِّ اغفرْ لي وتُبْ عليَّ، إنك أنت التَّوَّاب الغفور".

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦٤١٧.






**واتە: "پەروەردگارم لێم خۆشبە، تۆبەم لێ وەربگرە، بەڕاستی تۆ تۆبەوەرگر و بەخشندەیت".**[1]

هەر لە دیوەخانەکەیدا جاروبار منداڵانی شاری (مەدینە)یان بۆ دەهێنا، نزای بۆ دەکردن و دەستی بەسەردا دەهێنان و نزای بەرەکەتی بۆ دەکردن.[2]

نموونەیەکی تر لەوانە: جارێکیان ئەبوسەعید -ڕەزای خوای لێ بێت- مونزیری کوڕی هێنایە لای پێغەمبەر ﷺ کاتێ لەدایکبوو، پێغەمبەرﷺ لەسەر ڕانی خۆی داینا، ئەبو سەعید فەرمانی دا کوڕەکەیان لەسەر ڕانی پێغەمبەر ﷺ هەڵگرت و دووریان خستەوە، پێغەمبەرﷺ ڕاچەنی و فەرمووی: **"منداڵەکە چی لێ هات؟"** ئەبو سەعید وتی: بردمانەوە ماڵێ، فەرمووی: **"ناوی چی بوو؟"** وتی: فیسار، پێغەمبەری خوا فەرمووی: **"نەخێر ئەو ناوی مونزیر دەبێت"**، لەو ڕۆژەوە ناوی لێنرا (مونزیر).[3]

هەروەها لە دیوەخانەکەیدا نۆبەرەی بەروبومی خورمایان بۆ دەهێنا لە کاتێکدا کە خورما میوە و خۆراک و تینی مەدینەییەکان بوو، کە نۆبەرەیان دەبینی دڵیان خۆش دەبوو، دەیان هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ کاتێ کە هەڵیدەگرت دەیفەرموو: **"اللهمَّ بارك لنا في**

---

١- مسند أحمد، رقم الحديث: ٤٧٢٦. سنن أبي داود: ١٥١٦.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٣٩٠٩، ٥٤٧٠، ٥٤٦٧. صحيح مسلم: ٢١٤٤- ٢١٤٦.

٣- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦١٩١. صحيح مسلم: ٢١٤٩



**ثَمَرِنا، وبارك لنا في مَدِينتنا، وبارك لنا في صاعِنا، وبارك لنا في مُدِّنا، اللهمَّ إنَّ إبراهيمَ عبدُك وخليلُك ونبيُّك، وإني عبدُك ونبيُّك، وإنه دعاك لمكة، وإني أدعوك للمدينة بمثل ما دعاك لمكة ومثله معه".**

واتە: **"خودایە ئەم بەرووبومەمان پیرۆزکە، شارەکەمان پیرۆزکە، گەز و پێوانەکەمان پیرۆزکە، تەرازووەکەمان پیرۆز کە، خودایە (ئیبراهیم) بەندە و دۆست و پێغەمبەری تۆ بوو، منیش بەندە و پێغەمبەری تۆم، ئەو دوعای مەککەی لێ کردی، منیش دوعای هەمان شتی مەککە لە تۆ دەکەم بۆ مەدینە و بگرە زیاتریش"**، پاشان بچوکترین مێردمناڵی ئامادەبووانی بانگ دەکرد و تۆبەرەکەی پێ دەدا.[1]

دیوەخانی پێغەمبەر ﷺ مەودایەکی سوعبەت و گاڵتەوگەپی جوانی تێدا بووە سیمای پڕ لە سامی دیوەخانی پێغەمبەر ﷺ و، شکۆی ڕوخساری پیرۆزی ﷺ ڕێگر نەبوو لەبەردەم هەڵچوونەکانی ژیاندا، جارێکیان قسەی دەکرد لەگەڵ هاوەڵەکانیدا پیاوێکی دەشتەکی لە پاڵیدا دانیشتبوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"پیاوێکی بەهەشتی داوای لە خودای گەورە کرد ڕێگەی کشتوکاڵی پێ بدات، خودا پێی فەرموو: (ئەرێ تۆ بە ئاواتت نەگەیشتووی؟) وتی: بەڵێ خودایە، بەڵام حەزم لە کشتوکاڵە، فەرمووی: تۆوی چاند، بە**

---

[1] - صحيح مسلم، رقم الحديث: ١٣٧٣.



چاوتروکانێك کشتوکاڵەکەی سەوز بوو، پێ گەیی و کاتی چنینەوەی هات، وەك باڵای شاخی لێهات، خودای گەورە فەرمووی: (ئادەمیزاد ئیتر چیت دەوێت، بەڕاستی تۆ هیچ تێرت ناکات!)". کاتێك پێغەمبەر ﷺ لەوتەکەی بووەوە، کابرای دەشتەکی وتی: پێغەمبەری خوا، بێ گومان ئەو کابرایە یان کۆچکەری یان پشتیوان بووە، چونکە هەر ئەوان کشتوکاڵ دەکەن، بەڵام ئێمە کشتوکاڵمان نیە، هەرچی لە دیوەخانەکەدا بوو دەستی کرد بە پێکەنین، پێغەمبەریش ﷺ پێکەنی.[1]

پێدەچێ ئەو دیوەخانە، جێی پێشوازیی شاندە هاتووەکانیش بووبێت، چونکە ڕێبواران کاتێك لە دەرەوەی شار شەویان دەکردەوە، پاشان دەمەو چێشتەنگاو خۆیان دەکرد بە ناو شاردا، پێغەمبەریان ﷺ لەو دیوەخانەدا دەبینی.

**یەکێك لەو نموونانە:** شاندێکی خێڵی (موزەرییەکان) بوو، کە لە گەرمەی نیوەڕۆدا هاتنە خزمەتی، بینی کە چەند هەژار و کەمدەستن، ڕووخساری کرژ و خەمبار بوو بۆ بارودۆخیان، پاشان وتارێکی دا بۆ خەڵك و هانی دان بۆ خێر و چاکەکردن، هەتا دوو شارا خۆراك و جلوبەرگ کۆکرایەوە.[2]

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٢٣٤٨، ٧٥١٩.

٢- صحيح مسلم، رقم الحديث: ١٠١٧.



گومان وایە کە هەر لەو دیوەخانەدا بووبێ جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت)، ئامادەبوو لە شێوەی پیاوێکی سەرتاپا سپی و موو ڕەش و پاك و پوخت کە هیچ نیشانەی ڕێگای دووری پێوە دیار نەبوو و کەس نەیدەناسی، پرسیاری کرد لە بارەی ئیسلام و باوەڕ و چاکە و نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی.[1]

لەهەمان ئەو دیوەخانەدابوو کە ضیمامی کوڕی ثەعلەبە برای بەنو سەعدی کوڕی بەکر –ڕەزای خوای لێ بێت– هات و، وشترەکەی یەخ دا لە ناو مزگەوتدا، پاشان وتی بە پێغەمبەری خوا ﷺ : ئەرێ ڕۆڵەی عەبدولموطەلیب؟ فەرمووی: **"وەڵامت دەدەمەوە فەرموو"**، وتی: پرسیارم هەیە ڕەنگە پێداگری بکەم لەسەر پرسیارەکەم، بۆیە سنگت فراوان بێت، فەرمووی: **"چۆنت پێ باشە پرسیار بکە"**، پرسیاری لەبارەی پایەکانی ئیسلامەوە لێکرد، پاشان وتی: "سوێند بەو کەسەی تۆی بەڕاستی ناردووە، هیچ زیاد و کەمی ناکەم"، کە ڕۆشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"پیاوێکی زانابوو، خۆ ئەگەر ڕاستبێژبووبێت، ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە"**[2]

وادیارە هاوەڵان بە نۆرە سەردانی پێغەمبەریان کردووە، وەك لە گێڕانەوەکەی عومەردا –ڕەزای خوای لێ بێت– هاتووە دەڵێ: من و دراوسێیەکی پشتیوان لەدەرەوەی مەدینەدا نیشتەجێ بووبووین،

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٠، ٤٧٧٧. صحيح مسلم: ٨-١٠.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦٣.



بەسەرە دەهاتینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەو ڕۆژێك دادەبەزی و منیش ڕۆژێك، کە من دادەبەزیم هەواڵەکانی ئەو ڕۆژەم سەبارەت بە نیگا و شتی تر پێ دەدا، ئەگەر ئەویش دابەزیایە هەمان کاری دەکرد.[1]

پێغەمبەر ﷺ لەو دیوەخانەدا وەك یەکێك لەهاوەڵان دادەنیشت و، هێمایەکی خۆجیاکردنەوەی نەبوو، بێگانەیەك بهاتایە لەناو هاوەڵاندا نەیدەناسیەوە، هەندێ جاریش پرسیاری دەکرد، کێ لە ئێوە ڕۆڵەی عەبدولموطەلیبە؟ شتێکیان نەدەبینی پێغەمبەر ﷺ جیابکاتەوە، لە هاوەڵانی، مەگەر سامی ڕووخساری.. بۆیە هەندێ: دەیان وت: ئەو پیاوە سپییەیە کە پاڵی داوەتەوە، کە هاوەڵان ئەوەیان بینی، داوایان کرد لە پێغەمبەر ﷺ ڕێگە بدات سەکۆیەکی قوڕی بۆ دروست بکەن، بۆ ئەوەی میوان بیناسێتەوە، ئەویش مۆڵەتی پێدان، ئەوەش لە دوایین ڕۆژەکانی ژیانیدا بوو، ساڵی شاندەکان، ساڵی نۆیەمی کۆچی.[2]

پێغەمبەر ﷺ ڕووخۆشی و ڕووتێکردنی وەك یەك دابەشکردبوو بەسەر هاوەڵەکانیدا، تا ئەو کاتەی لە لای هەڵدەستان، هەریەکەیان وای دەزانی نزیکترینە لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث:٨٩. صحيح مسلم: ١٤٧٩

٢- خلق أفعال العباد للبخاري: ٢٥، سنن أبي داود: ٤٦٩٨






هەندێ جار دیاریەك خواردن بوایە و بهاتایە بۆ پێغەمبەر ﷺ لە ناو هاوەڵانیدا هەموویان پێکەوە دەیانخوارد، سەمرەی کوڕی جوندوب -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین خواردنێکیان هێنا، گۆشتاو و تریتی نان بوو، دەڵێ: پێغەمبەر دانیشتبوو لێمان خوارد و هەتا پێش نیوەڕۆ هەرکەسێك دەهات لێی دەخوارد، کۆمەڵێك دەهاتن دەیانخوارد و هەڵدەستان، پاش ئەوان کۆمەڵێکی تریش دەهاتن بەدوایاندا، پیاوێك پێی وت، پێغەمبەری خوا، خواردنی تر دەخرایە سەری؟ فەرمووی: لە لایەن خەڵکی سەر زەوییەوە نەخێر، مەگەر ئەو زیادبوونە لە ئاسمانەوە بووبێت.[1]

جارێکیان مێیەکیان بە دیاری بۆ هێنا، لەو ڕۆژگارەدا خواردن کەم بوو، بە هاوسەرەکانی فەرموو: **"ئەو مەڕە بکەن بە خواردن، سەیرێکی ئەو نانەش بکەن، بیکەن بە گۆشتاو و تریتی تێکەن".** پێغەمبەر ﷺ لەگەنێکی خواردنی هەبوو پێیان دەوت (الغَرَّاء)، کە بە چوار پیاو هەڵیان دەگرت، پاش ئەوەی ڕۆژبووەوە و گەیشتنە چێشتەنگاو خواردنی سەر دەفرەکەیان هێنا، بەدەوریدا خڕبوونەوە، پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەژنۆ دانیشت، کابرای دەشتەکیش وتی: ئەمە چۆن دانیشتنێکە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"خواوەند منی کردووە بە بەندەیەکی بەخشندە و، نەیکردوم بە کەسێکی دڵڕەقی**

---

١- مسند أحمد، رقم الحديث: ٢٠١٣٥، ٢٠١٩٦. صحيح مسلم: جامع الترمذي: ٣٦٢٥.






سەرسەخت، لە هەموو لایەکەوە لێی بخۆن، سەر تۆپەکەی بهێڵنەوە، خودا بەرەکەتی تێدەخات". پاشان فەرمووی: "بیگرن و بیخۆن، سوێندم بەو کەسەی گیانی موحەمەدی بەدەستە، دەروازەکانی وڵاتی فارس و ڕۆمەکانتان بەسەردا دەکرێتەوە، هەتا خواردن زۆر دەبێت و ناوی خودای لەسەر ناهێنرێت."[1]

هەندێ جار دانیشتنەکان درێژخایەن بوون هەندێ جاریش کورت، لە هەموو باسێکی تێدا دەگوزەرا، کە خۆریش گەرم دادەهات، پێغەمبەر ﷺ هەڵدەستا، لە دانیشتنەکەی هەڵنەدەستا تا دەیفەرموو:"سبحانك اللهمَّ ربي وبحمدك، أشهد أن لا إله إلا أنت، أستغفرُك وأتوبُ إليك" .

واتە: "پاك و بێگەردی و سوپاس بۆ تۆ خوداو پەروەردگاری من، شایەتی دەدەم جگە لە تۆ خودایەکی تر نیە، داوای لێ خۆشبوونت لێ دەکەم، تۆبە دەکەم بەرەو لای تۆ".[2]

کەمجار هەبوو لە دانیشتنەکەدا هەستێ پێش ئەوەی ئەم دوعایە بۆ هاوەڵانی بخوێنێتەوە: "اللهمَّ اقْسِمْ لنا من خشيتك ما تَحُولُ به بيننا وبين معاصيك، ومن طاعتك ما تبلِّغُنا به جنَّتك، ومن اليقين ما تهوِّن به علينا مصائبَ الدنيا، اللهمَّ متِّعنا بأسماعنا وأبصارنا وقوتنا،

---

١- سنن أبي داود، رقم الحديث: ٣٧٧٣. ابن ماجه: ٣٢٦٣، ٣٢٧٥.

٢- مسند أحمد، رقم الحديث: ١٠٤١٥، ١٩٧٦٩، ١٩٨١٢، ٢٤٤٨٦. سنن أبي داود: ٤٨٥٧-٤٨٥٩



واجعله الوارثَ منا، واجعل ثأرَنا على مَن ظلمنا، وانصرنا على مَن عادانا، ولا تجعلْ مصيبتَنا في ديننا، ولا تجعل الدنيا أكبرَ همِّنا، ولا مبلغ علمنا، ولا تسلِّط علينا مَن لا يرحمنا"

واتە: "خودایە لە ترس و خۆش بەشی ئەوەندەمان بدەریێ کە ڕێگەی گوناهمان لێ بگرێت، بەشی ئەوەندەش گوێڕایەڵیمان بدەرێ کە پێی بگەینە بەهەشتەکەت، ئەوەندەش دڵنیاییمان پێ بدە دەرد و بەڵاکانی دونیامان لەسەر ئاسان بکات، خودایە چێژی بیستن و بینین و هێزمان پێ ببەخشە تا لەم دونیادا بین، ئەمەش بکە بەمیراتی دوای خۆمان، تۆڵەمان بستێنە لەوانەی ستەمیان لێکردین، سەرمان بخە بەسەر ئەوانەدا کە دژایەتیمان دەکەن، دونیا مەکەرە خەمی هەرە گەورەمان، تاوانی پێگەیشتنمان، کەسێکی بێ بەزەییمان بەسەردا زاڵ مەکە".[١] پاشان هاوەڵەکانی بڵاوەیان پێ دەکرد بەرەو کاروبار و ماڵ و منداڵەکانیان، بۆ کورتە خەوی پێش نیوەڕۆ (قەیلولە).

---

١- جامع الترمذي، رقم الحديث: ٣٥٠٢. سنن الكبرى للنسائي: ١٠٢٣٤، ١٠٢٣٥



# سەردانەکانی پێغەمبەر ﷺ



هەندێ جار پێش نیوەڕوان پێغەمبەر ﷺ حەزی لە سەردانی کەسوکار و هاوەڵەکانی بوو، بۆ نموونە:

ڕۆیشتنی بۆ ماڵی فاطمەی کچی -ڕەزای خوای لێ بێت-، بۆ ئەوەی حەسەنی کوڕی عەلی ببینێت -ڕەزای خوای لێ بێت-، لە حەوشەی ماڵەکەدا دەوەستا و بانگی دەکرد: **"کوڕە خنجیلانەکە، کوڕە خنجیلانەکە"** هەتا حەسەنی خنجیلانە بە گاگۆلکێ دەهاتە دەرەوە، هەڵی دەگرت و ماچی دەکرد و دەیفەرموو: **"خودایە من ئەمەم خۆش دەوێت، داوادەکەم تۆش خۆشت بوێت، ئەو کەسەشت خۆش بوێت کە ئەمی خۆشدەوێت"**.[1]

جارێکیان چوو بۆ ماڵی فاطمە -ڕەزای خوای لێ بێت- و هەواڵی عەلی لێ پرسی -ڕەزای خوای لێ بێت- فەرمووی: **"ئامۆزاکەت لە کوێیە؟"** فاطمە وتی: شتێك لە نێوانماندا ڕوویدا و چووە دەرەوە، کەسێکی نارد بە دوایدا، پێیان وت: لە مزگەوت نوستوە، ڕۆیشت بۆ

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٢١٢٢، ٥٨٨٤. صحيح مسلم: ٢٤٢١.



لای، بینی عەباکەی داخزاوەتە لاتەنیشتی و خۆڵی پێوە نیشتووە، دەستی کرد بە تەکاندنی خۆڵەکە و دەیفەرموو: **"هەستە ئەبو توراب هەستە ئەبو توراب"**[1]، ئەبو توراب واتە خۆڵاوییەکە.

نموونەیەکی تری سەردانی بۆ هاوەڵەکانی –ڕەزای خوایان لێ بێت– ئەوەبوو کە سەردانی موسوڵمانە کەمدەست و لاوازەکانی دەکرد و، دەچوو بەسەری دەکردنەوە، هەروەها زیارەتی نەخۆشی دەکرد و، دەچوو بە دەم بانگهێشتی هاوڕێکانیەوە و، هەندێ جاریش بە تەنها دەڕۆیشت بۆ نموونە:

بە دەمەوە چوونی بانگهێشتی مولەیکەی نەنکی ئەنەسی کوڕی مالك –ڕەزای خوای لێ بێت– بانگهێشتی پێغەمبەری کرد ﷺ بۆ نانخواردن لە لای، ئەویش چوو لێی خوارد، پاشان فەرمووی: **"هەستن با نوێژەکەتان بۆ بکەم"**.

ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: حەسیرێکمان هەبوو بە هۆی زۆر لەسەر دانیشتنەوە ڕەش هەڵگەڕابوو، هێنام و ئاوم پێداکرد، پێغەمبەر ﷺ لە سەری وەستا و من و منداڵە بێ باوکەکە لە پشتیەوە ڕیزبووین، داپیرەش لە پشتمانەوە وەستا، پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژی بۆ کردین، دوو ڕکاتی کرد، پاشان ڕۆیشت.[2]

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٤٤١، ٣٧٠٣. صحيح مسلم: ٢٤٠٩.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٣٨٠، ٨٦٠. صحيح مسلم: ٦٥٨.




هەندێ جار هەندێ لە هاوسەرەکانی لەگەڵ خۆیدا دەبرد.

لە ئەنەسەوە -ڕەزای خوای لێ بێت- دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دراوسێیەکی فارسی هەبوو، شلەیەکی خۆشی دەزانی، شلەو گۆشتەکەی خۆشترین بۆنی هەبوو، ڕۆژێکیان هات و بانگێشتی پێغەمبەری کرد ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"عائیشەشم لەگەڵدایە"**، کابرای فارسی وتی: نابێت، پێغەمبەری ﷺ فەرمووی: **"منیش نایەم"**.

کابرا هاتەوە بۆ لای و بانگێشتی کردەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەم خێزانەم لەگەڵدایە"**. کابرا وتی: نابێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **"منیش ئامادە نابم"**. کابرا دیسان هاتەوە و بانگەشەی پێغەمبەری کرد بۆ داوەتەکەی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەم خێزانەشم لەگەڵدا دەبێت"**. کابرا وتی: بەڵێ باشە لە جاری سێیەمدا، ئەنجا هەردووکیان هاوشانی یەکتر چوون بۆماڵی کابرای فارس.[1]

هەروەها لە ئەنەسەوە -ڕەزای خوای لێ بێت- دەگێڕێتەوە:

کە بەرگدروویەک پێغەمبەری بانگێشتکرد بۆ نانخواردن لای، ئەنەس دەڵێت:

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٠٣٧.



لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕۆیشتم بۆ ئەو نان خواردنە، کابرا نانێکی جۆ و شلەیەکی پڕ لە کولەکە و گۆشتی قاورمەی هێنایە پێشەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ زیاتر لە کولەکەکەی دەخوارد، کە ئەوەم بینی لەوەم بۆ نزیك دەکردەوە، تا بیخوات و خۆم وازم لێ دەهێنا، چیدی لەو ڕۆژەوە من حەزم لەو کولەکەیە بوو.[1]

هەندێ جاریش لەگەڵ هەندێ هاوەڵیدا دەچوون بەدەم بانگهێشتی خەڵکەوە.



١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٢٠٩٢، ٥٤٢٠، ٥٤٣٦، ٥٤٣٩. صحيح مسلم: ٢٠٤١



# بەناو بازاڕدا دەڕوات



پێغەمبەر ﷺ کە بەڕێگادا بڕۆشتایە زوو پێی هەڵدەگرت و، سنگی بۆ پێشەوە نەوی دەکرد، وەك لە لێژاییەکەوە بۆ خوارەوە شۆڕ بێتەوە، ئەمەش ئاماژەیە بۆ بێفیزیی، کە لای بکردایە بەهەر لایەکدا جەستەی لەگەڵدا وەردەگێڕا، لە ڕۆیشتندا هاوەڵانی لە پێش و لاتەنیشتەوە دەڕۆیشتن و دوای نەدەکەوتن، هەرگیز کەسێك بەدووی نەکەوتووە.[1]

هەرکەسێکی ببینیایە بەدەم زەردەخەنەوە ڕووی تێدەکرد، جەریر -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێ: هیچ کاتێك پێغەمبەری خودام پێ نەگەیشتووە بەدەم زەردەخەنەوە نەبوو بێت.[2]

عەبدوڵڵای کوڕی حارثی کوڕی جەزء -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێ: کەسێکم نەدیوە لە پێغەمبەری خودا زیاتر دەم بەزەردەخەنە بێت.[3]

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٣٥٦١، ٥٩١٢. صحيح مسلم: ٢٣٣٠، ٢٣٤٠.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٣٠٣٥. صحيح مسلم: ٢٤٧٥.

٣- مسند أحمد، رقم الحديث: ١٧٧٠٤. جامع الترمذي: ٣٦٤١.



کە بەلای منالاندا بگوزەرایە سلاوی لێ دەکردن و، دەستی بە ڕووخسارياندا دەهێنا، جابری کوڕی سەمرە –ڕەزای خوای لێ بێت– وتی: ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ لەماڵ دەرچوو، منیش لەگەڵیدا ڕۆیشتم چەند منداڵێك بەرەو ڕووی هاتن، پێغەمبەر ﷺ دەستی بە ڕوومەتی هەموویاندا هێناو، دەستی هێنا بە ڕوومەتی منیشدا، هەستم بە فێنکی و بۆنی خۆشی دەستی کرد، وەك ئەو کاتە لە سەبەتەی بۆن دەری هێنابێت.[1]

ڕۆژێکیان بینی وا لە مزگەوتدا، کۆمەڵێك ژن دانیشتبوون، کاتێك بەلایاندا تێپەڕی بەدەستی سلاوی بۆ کردن.[2]

کە بە هاوەڵێکی بگەیشتایە دەستی بەسەریدا دەهێنا و دوعای بۆ دەکرد.[3]

لەبازاڕدا هەرکەسێك داوای لێ بکردایە دەوەستا، لەوانە بوو کەنیزەکێك یان ژنێك بێت، بۆیان دەوەستا و گوێی لێ دەگرتن، عومەری کوڕی حاتەمی طائی –ڕەزای خوای لێ بێت– لەبارەی یەکەم بەیەکگەیشتنی خۆی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەڵێت: ژنێك کە منداڵێکیشی پێبوو بانگی لێکرد: پێغەمبەری خوا کارێکمان پێتە، بۆ ماوەیەکی درێژ لە گەڵیدا وەستان، هەتا من بێزاربووم لەو درێژ

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦٢٤٧. صحيح مسلم: ٢١٦٨، ٢٣٢٩.

٢- مسند أحمد، رقم الحديث: ١٩٢١٤، ٢٧٥٦١، ٢٧٥٨٩. سنن أبي داود: ٥٢٠٤.

٣- سنن النسائي، رقم الحديث: ٢٦٧. صحيح ابن حبان: ١٢٥٨.



وەستانە، لە دڵی خۆمدا گوتم: شایەتی دەدەم کە تۆ لە ئایینی مـن و نوعمانی کوڕی مونذیر بێ بەریت، خۆ ئەگەر تۆ پاشا بویتایە ئەوەندە لەگەڵ ژن و منالێکدا نەدەوەستای، پاشان خودا خۆشەویستی ئەوی خستە دڵمەوە.[1]

بـە ئاسـایی هــەنگاوی پەلــەی دەنـا، دوور لـە سـامنواندنی نـا پێویست، جارێکیان دای بەلای گەنجێکدا خەریکی کەوڵکردنی پێستی مەڕێك بوو، کارساز نەبوو و لێی نـەدەزانی، لێـی نزیکبـووەوە و پێـی فەرموو: **"خـۆت لادە بـا پیشـانت بـدەم، وا بـزانم بـە باشـی نـازانی پێسـتەکە کـەوڵ بکـەیت"**، دەسـتی خسـتە نێـو پێسـت و گۆشـتی مەڕەکـەوە، دەسـتی پێـدا گێـڕا، تـا نزیـك بنبـاڵی لـە نـاو گۆشـت و پێستەکە ون بوو، پاشان هەسـتا و فـەرمووی: **"کـوڕم بـەم شـێوازە مەڕەکە کەوڵ بکە"**. پاشان ڕۆیشت.[2]

جارێکیان بـەلای پیاوێکدا تێپـەڕی مەنجـەڵێکی خستبووە سـەر ئاگر، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: **"ئەرێ خواردنەکەت پێگەییوە؟"** کابرا وتی: بەڵێ پێغەمبەری خـودا ﷺ دایـك و بـابم بـەقوربانت بـن، هەندێکی پێدا و خستیە دەمی و بە دەم ڕۆشتنەوە دەیجوی.[3]

---

١- الأحاديث الطوال للطبراني: رقم الحديث: ١.

٢- سنن أبي داود، رقم الحديث: ١٨٥. سنن ابن ماجه: ٣١٧٩.

٣- سنن أبي داود، رقم الحديث:١٩٢.



کــە لــە دەرگــای هــەر مــاڵێکی بدایــە ڕووبــەڕووی دەرگاکــە نەدەوەسـتا، بـەڵکو لای ڕاسـت یـان چـەپیەوە دەوەسـتا، ئـەو کاتـە ماڵەکان بچووك بـوون و، دەرگاکـان ڕووپۆشـیان نـەبوو، دەیفـەرموو: "سلاوتان لێ بێت، سلاوتان لێ بێت".[1]



١- مسند أحمد، رقم الحديث: ١٧٦٩٤. سنن أبي داود: ٥١٨٦.



# سەردانەکانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا



بۆ نموونە سەردانەکەی بۆ لای عەتبانی کوڕی مالك -ڕەزای خوای لێ بێت- لە چێشتەنگاودا، ئەبوبەکر و عومەر و هەندێ لە هاوەڵانی لەگەڵدا بوو، پێی فەرموو: دەتەوێ لە کوێی ماڵەکەتدا نوێژبکەم؟ عەتبان شوێنێکی ماڵەکەی پێ نیشاندان و حەسیرێکی بۆ ڕاخست و چواردەورەکەی بۆ ئاوڕشێن کرد، دوو ڕکات نوێژی پێ کردن، پاشان عەتبان داوای لێکرد بمێنێتەوە، لەبەر ئەوەی خواردنیان دروست کردووە تا لێی بخوات، ئەویش مایەوە و، لە خواردنەکەی خوارد.[1]

سەردانی هەرکەسێکی بکردایە دڵی خۆش دەکردن، بەڕەوشتی بەرز و چاکەخوازی خۆی خۆشنووی دەکرد.

ئەنەس -ڕەزای خوی لێ بێت- دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بەڕەوشتترین مرۆڤ بوو، لەگەڵمان تێکەڵاو دەبوو دەمایەوە، براگچکەیەکی سێ ساڵانەم هەبوو، هەر کە تەشریفی بهاتایە بۆ ماڵمان گاڵتەی لەگەڵدا دەکرد و دەی خستە پێکەنین، ڕۆژێکیان تەشریفی

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٤٢٥، ١١٨٦. صحيح مسلم: ٣٣.



هێنا، ئەو برایەم غەمبار بوو، فەرمووی: **"ئەرێ دایکی سولەیم، ئەوە بۆچی ئەبو عومەیری کوڕت بە غەمباری و بێ تاقەتی دەبینم"**، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ باڵندە بچکۆلەکەی مردووە، هەموو جارێ یاری لەگەڵدا دەکرد، پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ لای منداڵەکە و دەستی هێنا بەسەریدا و فەرمووی: **"ئەبوعومەیر، ئەرێ چیکرد نوغەیر؟ ئەبوعومەیر، ئەرێ چیکرد نوغەیر ؟"**[1] (نوغەیر ناوی باڵندەکە بوو).

کە سەردانی هەر هاوەڵێکی خۆی بکردایە و نانی بخواردایە دوعای خێری بۆ دەکردن، جارێکیان سەردانی سەعدی کوڕی عەبادەی کرد –ڕەزای خوای لێ بێت– نان و ڕۆنی بۆ هێنا پێغەمبەری خوا ﷺ لێی خوارد، پاشان فەرمووی: **"خودایە، ڕۆژووەوانان ڕۆژووتان لە لاشکێنن و پیاوچاکان نانتان بخۆن و فریشتەکان سڵاوتان لێ بکەن."**[2]

هەروەها سەردانی بوسری کوڕی ئەبو بوسری کرد –ڕەزای خوای لێ بێت– خواردن و ماستاوی خستە بەردەمی، پێغەمبەر ﷺ لێی خوارد، پاشان شەربەتێکی بۆ هێنا و خواردیەوە، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"خودایە بەرەکەت بخەیتە ڕۆزیەکەیانەوە، لێیان خۆشبە و بەزەییت بێتەوە پێیاندا"**.[3]

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦١٢٩، ٦٢٠٣. صحيح مسلم: ٢١٥٠.

٢- مسند أحمد، رقم الحديث: ١٢١٧٧، ١٢٤٠٦. سنن أبي داود: ٣٨٥٤.

٣- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٠٤٢.



# سەردانی نەخۆش



یەکێك لە سەردانەکانی بریتی بوو لە سەردانی نەخۆش، لەوانە: سەعدی کوڕی عەبادە، ئازارێکی هەبوو، پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ لای و (عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف و، سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص و، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود)ی لەگەڵدا بوو -ڕەزای خوای لێ بێت- کە چوونە ژوورەوە لە هۆش خۆی چوو بوو و، کەسوکاری بەدەوریەوە بوون، پرسیاری کرد: **"گیانی سپاردوە؟"** وتیان: نەخێر پێغەمبەری خوا، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ دەستی کردە گریان و، کاتێك خەڵکەکە ئەمەیان بینی ئەوانیش گریان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"مەگەر نابیستن! کە خودا نە بە دڵۆپی فرمێسك ئەشکەنجەی بەندەکانی دەدات و نە بە خەمی دڵەکان، بەڵکو بەمە -ئاماژەی بە زمانی دا- سزا دەدات یان دەبەخشێت".** [1]

نموونەیەکی تر: سەردانی جابری کوڕی عەبدوڵڵایە -ڕەزای خوای لێ بێت-، جابر دەڵێت: نەخۆش کەوتم، پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی کردم، ئەبوبەکری لەگەڵدا بوو، بەپێ هاتبوون بۆ لام، منیش

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١٣٠٤. صحيح مسلم: ٩٢٤.



لەناو خێڵی (بەنو سەلیمە)ی کەسوکارمدا بووم، کە هاتبوو من لە هۆشخۆچـــوویبووم، دەســـتنوێژی گرتبـــوو، پاشـــان بـــە ئـــاوی دەستنوێژەکەی ئاوپرژێنی کردبووم، ئەنجا هۆشم هاتبووە، دەبینم پێغەمبەر ﷺ وەستاوە، وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ چی بکەم لە ماڵ و سامانەکەم، من میرات گرم نیە، پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی نەدامەوە، هەتا ئایەتی میرات هاتە خوارەوە.[1]



١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦٧٢٣. صحيح مسلم: ١٦١٦.



# حەوانەوەی قەیلولە



کە خۆری چێشتەنگاو بەرزدەبووەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەچووە ماڵی ئەو هاوسەرەی کە سەرە ڕۆژی خۆی بوو، لەگەڵ چوونەژوورەوەیدا یەکەم شتێ دەیکرد یادکردنی خوا و سیواککردن و سڵاوکردن بوو لە هاوسەری، پاشان چوار ڕکاتی نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد، هەندێ جاریش زیاتری دەکرد و، دەیگەیاندە شەش ڕکات یان هەشت.[1]

هەندێ جار ڕێکدەکەوت خواردنیان هەبوو لە ماڵەوە، دەیخوارد بەمەرجێ نانی بەیانی نەخواردبێت، هەندێ جار کە خواردنی دەخرایە بەردەم، هەرچەندە بەڕۆژووش بوو دەیشکاند، عائیشە –ڕەزای خوای لێ بێت– جارێکیان بە پێغەمبەرﷺی وت: پێغەمبەری خوا دیاریەکمان بۆ هاتووە، یان کەسێك سەردانی کردووین و منیش شتێکم بۆ حەشارداویت، فەرمووی: **"ئەو شتە چیە؟"** عائیشە وتی: کەشك و خورما و ڕۆنمان هەیە، فەرمووی: **"بیهێنە"**، هێنای و لێی خوارد، پاشان فەرمووی: **"بەڕۆژووش بووم"**.

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١١٠٤، ١١٧٦. صحيح مسلم: ٣٣٦.



لە یەکێك لەو سەردانانەیدا بۆ لای جوەیریـەی هاوسـەری -ڕەزای خوای لێ بێت- بینی وا لەسەر بەرماڵ یادی خوا دەکات، پێشتریش کە سەر لەبەیانی هاتبوو بۆ لای بەهەمان شێوە بوو، فەرمووی: **"ئەرێ لەسەر هەمان ئەو بارەبوویت کە پێشتر سەر لە بەیانی بینیم؟"** وتی: بەڵێ، فەرمووی: **"من دوای تۆ چوار وشەم سێ جار وتەوە، ئەگەر بیکێشیت لەو شتانەی تۆ وتوتن قورستر دەبن، ئەوانیش:"سبحان الله و بحمده، عدد خلقه، ورضا نفسه، وزنة عرشه، ومداد کلماته"**[١]، واتە: **"پاك و بێگەردی و سوپاس بۆ خودا، بە ئەندازەی ژمارەی دروستکراوەکانی و ڕەزامەندی خۆی و، قورسایی تەختەکەی و، بە ئەندازەی مرەکەبی وشەکانی"**...

ئەو کاتەش کە ساتەوەختی مانەوەی ماڵەوەی بوو لەگەڵ هاوسەرەکانیدا.

هەندێ جار چەند ژنێکی باوەڕدار دەهاتنە خزمەتی و لەبارەی کاروباری ئاینەکەیانەوە هەندێ پرسیاریان لێدەکرد کە نەیاندەوێرا ئەو پرسیارانە لەبەردەم پیاواندا بکەن، ئەمەش بە ئامادەبوونی دایکانی باوەڕداران بوو، ئەوە بوو ئەوان ئەم فەتوا پێغەمبەرانانەیان دەپاراست کە تایبەت بوو بەکاروباری ژنانەوە.

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٥٠١١.

نمونەیـەك لەوانـە، جارێکیـان ژنـی یـەکێك لـە پشـتیوانان هاتـە خزمەتی، ئەمیش ﷺ لای عائیشـە بـوو – ڕەزای خـوای لـێ بێـت–، پرسیاری خۆشۆردنی ژنی حەیزداری لێکرد، فـەرمووی: **"کەسێك لـە ئێوە لەوبارەدا ئاو و گەڵای مۆرد[1] بـەکاربهێنێ، بەباشـی خـۆی پـاك بکاتەوە، پاشان ئاو بکات بەسەریدا و، بە توندیی دەستی تێ بخات تا دەستی دەگاتە بن موەکانی سەری و، ئاو بکات بەسەریدا، پاشان پەڕۆیەکی بۆن خۆش بخاتە سەری و خۆی پێ پاك بکاتەوە"**. ژنەکە –ڕەزای خـوای لەسـەر بـێ– وتـی: چـۆن خـۆی پـێ پاکبکاتـەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فـەرمووی: **"سبحان الله، خـۆتی پـێ پاکبکـەرەوە"**. شەرمی کرد و ڕووی وەرگێڕا، عائیشە –ڕەزای خوای لێ بێت– دەڵێ: کە بینیم ڕووی وەرگێڕا و شەرمی کرد، ژنەکەم کەمەنـدکێش کـرد بـۆ لای خۆم و پێم وت: سەیری شوێنی خوێنەکە بکە و پـاکی بکـەرەوە، پێغەمبـەر ﷺ ئەمەی گوێ لێ بوو و ناڕەزا نەبوو.[2]

ئـوم سـولەیمیش جارێکیـان هاتـە خزمـەتی کـە لـە لای ئومـو سەلەمەی هاوسەری بوو –ڕەزای خوای لـێ بێـت– وتـی: پێغەمبـەری خوا ﷺ ڕاتان چۆنە ئەگەر ژنێك لـە خەونـدا پیاوەکـەی بچـێتە لای، ئایا دەبێ خۆی بشۆرێت؟ ئومو سەلەمەی هاوسەری وتی: دەستت بە

---

١- (مۆرد): جۆرە درەختێکە، کە لە سەردەمانی پێشوودا سوود لـە گەڵاکـەی بینـراوە وەك هۆکارێکی خاوێنکەرەوە.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٣١٤، ٣١٥، ٧٣٥٧. صحيح مسلم: ٣٣٢.

قورا چێت ئومو سولەیم ئابڕووی ژنانت برد لەبەردەم پێغەمبەردا ﷺ، ئومو سولەیم وتی: خودا شەرم ناکات لەڕاستی، ئێمەش پرسیاری شتێك لە پێغەمبەر دەکەین ﷺ کە بووەتە کێشە بۆمان، ئەمە باشترە لەوەی لەو بارەیەوە نابینا بین! پێغەمبەر ﷺ بە ئومو سەلەمەی فەرموو: "دەستی تۆ بە قوڕا چێت، بەڵێ ڕاستە ئوم سولەیم، پێویستە خۆی بشۆرێت ئەگەر هەستی بە تەڕی کرد"، ئومو سەلەمە وتی: پێغەمبەری خوا، ئایا ژنیش ئاوی هەیە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: "ئەی چۆن ڕۆڵەکەی لەو بچێت؟ ژنانیش دەستە خوشکی پیاوانن". [1]

ژنانی پشتیوانان چاوکراوەیی و بوێرییەکیان تێدابوو لە پرسیار و داوای ڕوونکردنەوەدا، تەنانەت عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێت- لەبارەیانەوە دەڵێ: باشترین ژن ژنانی پشتیوانان بوون، شەرمکردن ڕێی تێگەیشتن لە ئایینی لێ نەدەگرتن. [2]

هەندێ جاریش چەند هاوەڵێکی نزیکی بۆ کاری خۆیان دەهاتنە خزمەتی.

لەوانە، جارێکیان پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەکەیدا پاڵکەوتبوو، پشتەماڵێکی عائیشەی دابوو بە خۆیدا قوڵ و قاچی بەدەرەوە بوو، ئەبوبەکر -ڕەزای خوای لێ بێت- هات، داوای مۆڵەتی

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦٠٩١، ٦١٢١. صحيح مسلم: ٣١٠-٣١٤.

٢- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٥٢٦.



هاتنەژوورەوەی کرد، ڕێگەی پێ درا بەو حاڵەوە کێشەکەی خۆی بۆ باسکرد و ڕۆشت، پاشان عومەر هات -ڕەزای خوای لێ بێت- داوای مۆڵەتی کرد، مۆڵەتی پێدرا بەو حاڵەوە پرسیارەکەی کرد و ڕۆشت، پاشان عوسمان هات -ڕەزای خوای لێ بێت- داوای مۆڵەتی کرد، پێغەمبەر دانیشت و جلەکەی چاککرد و، فەرمووی بە عائیشەش -ڕەزای خوای لێ بێت- تۆش جلەکانت چاك بکە، ئەنجا مۆڵەتی هاتنەژوورەوەی پێ درا هەندێ قسەی کرد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ و ڕۆیشت.

خاتوو عائیشەش فەرمووی: کاتێك ئەبوبەکر هاتە ژوورەوە ڕانەچەنیت بۆی و گوێت پێ نەدا، پاشان عومەر هاتەژوورەوە و ڕانەچەنیت بۆی و گوێت پێ نەدا، بەڵام کە عوسمان هات، خۆت کۆکردەوە و دانیشتیت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"مەگەر شەرم نەکەم لەکەسێك کە فریشتەکان شەرمی لێ دەکەن؟ عوسمان پیاوێکی بەشەرمە، مەترسی ئەوەم هەبوو کە بەوشێوازە مۆڵەتم پێبدایە، نەهاتبا لام بۆ پێویستیەکەی".** [1]

خۆ ئەگەر ئەو پێغەمبەرە ﷺ لەناو ماڵی خۆیدا بوایە، ئەوا عائیشە وەسفێکی حاڵی دەکات کە چۆن بووە و، دەڵێ : کە دەهاتە ماڵەوە نەرمونیانترین و بەخشندەترین مرۆڤ بوو، پیاوێك بوو وەك

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٤٠١، ٢٤٠٢.



ئێوە، بەڵام ئەو هەمیشە دەم بە پێکەنین و زەردەخەنە بوو، جگە لە ئادەمیزادێکی ئاسایی شتێکی تر نەبوو، هەمیشە لە خزمەتی ژنەکانیدا بوو، نەعلەکانی هەڵدەپێکا و، جلەکانی دەدووریەوە، مەڕی دەدۆشی و، خزمەتی خۆی دەکرد و، لەناو ماڵدا وەکو یەکێك لە ئێوە کاری دەکرد.[1]

ئەو دیمەنێکی تێکەڵاویی هاوسەرێتی بوو لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ ئەو ژوورە بچوکە دیوارلێك نزیکەی ماڵەکەی پێویستی بەو هاوکارییەی ئەو نەبوو بۆ خێزانەکانی، بەڵام ئەوە گەورەیی ڕەوشتی ئەو بوو کە ئەو ماڵە هی هەموویانە، هەروەکو چۆن ژیانیش بۆ هەموومانە.

هەروەها ئەم ئاوڕدانەوە پێغەمبەریە، پەیامێکی گرنگی دانی هاوسەرانە و دڵخۆشبوونە بە ژیانی هاوسەرێتی، خودا سڵاوات بدات لەسەر باشترین کەسێك بۆ هەموو مرۆڤایەتی و باشترین کەسێك بۆ هاوسەرەکانی.

هەروەکو چۆن لەناو ماڵەکەیدا مەودایەکی فراوان هەبوو بۆ خۆشەویستی و بەزەیی، بەهەمان شێوە مەودایەکیش هەبوو بۆ هۆگریی و جوڵەی ژیان و خۆشیەکانی، ئەوە سەودەیە سەردانی عائیشە دەکات -ڕەزای خوای لێ بێت- لە ژوورەکەیدا،

---

[1]- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦٧٦، ٥٣٦٣.



پێغەمبەر ﷺ لەنێوانیاندا دانیشت، قاچی موبارەکی درێژکردبوو، عائیشە خواردنی دۆخەوای لێنابوو، بە سەودەی وت بخۆ، نەیخوارد، وتی: دەیخۆیت یان ڕووخسارتی پێ سواغ بدەم، هەر نەیخوارد، ئەویش بەدەست هەندێکی لێ هەلگرت و ڕووخساری پێ سواغ دا، پێغەمبەر ﷺ قاچی هەڵکێشا، تا خاتوو سەودە بتوانێ تۆڵەی خۆی لە خاتوو عائیشە بکاتەوە، ئەویش مشتێکی لە دۆخەواکە هەلگرت و ڕووخساری عائیشەی پێ سواغ دا، پێغەمبەریش ﷺ بەکاری ئەو دوانە پێدەکەنی، ئەوانیش هەموو پێدەکەنین و، هەڵچوونی دەنگە دەنگی خۆشی لە ماڵەکەی پێغەمبەر ﷺ بەرز دەبوویەوە، کە گوێیان لێبوو عومەر لەناو مزگەوتەوە بانگی کرد، ئەرێ عەبدوڵلای کوڕی عومەر، هۆ عەبدوڵلای کوڕی عومەر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"خێرا هەستن دەم و چاوتان بشۆن، وا بزانم ئێستا عومەر خۆی ئەکات بە ژووردا."**[1]

ئەو خۆشیی گاڵتەوگەپە، جموجۆڵێک بوو لەمیانەی ئەو بوارە فراوانەی کە پێغەمبەر ﷺ لەمەیدانی ژیاندا سازاندبووی؛ بەڕاستی لە ئایینەکەماندا بوار و دەرفەت زۆرە.

کاتی چێشتەنگاو هەتا نزیکی نوێژی نیوەڕۆ دەنووست، لە ماڵی هاوسەرەکانی دەخەوت، هەروەها ماڵی ئومو سلەیمی خوشکی شیری

---

١- السنن الكبرى للنسائي، رقم الحديث: ٨٩١٧. مسند أبي يعلى: ٤٤٧٦.





**پێغەمبەر ﷺ، کە لەو بارەیەوە پرسیاری لێ کرا، فەرمووی: "من پەیوەندی رەحم بەجێ دەهێنم، براکەی ئەو لەگەڵ مندا بوو کوژرا".[1]**

**هەندێ جار دەچوو بۆ ماڵەکەی و لەسەر جێگەکەی دەنووست، تەنانەت ئەگەر خۆشی لەماڵ نەبووایە، رۆژێکیان ئوم سولەیم هاتەوە پێیان وت: ئەوە پێغەمبەرە ﷺ لەسەر جێگاکەی تۆ نووستوە، کاتیش وەرزی گەرمای هاوین بوو، جەستەی پێغەمبەر ﷺ جواناوی دەردەکرد، تەنانەت پارچەی سەر جێگەکەی تەواو تەڕ دەکرد، ئوم سولەیم جواناوەکەی دەگوشیە ناو قاپێکەوە. کە پێغەمبەر ﷺ بێدار بووەوە دەبینێ ئوم سولەیم ئەو کارە دەکات، پێی فەرموو: "ئوم سولەیم ئەوە چی دەکەیت؟" وتی: پێغەمبەری خوا جواناوەکەی تۆ دەکەمە ناو بۆنی عەترەکانم، ئومێدەوارم بەرەکەتدار بێ بۆ مناڵەکانمان، فەرمووی راستیت پێکاوە و نزای خێری بۆ کرد.[2]**

---

۱- صحيح البخاري، رقم الحديث:٢٨٤٤. صحيح مسلم: ٢٤٥٥.

۲- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٣٣١، ٢٣٣٢





# بەرەو قوباء



چێشتەنگاوی هەموو ڕۆژێکی شەممە دەچوو بۆ (قوباء)، لە مزگەوتەکەیدا نوێژی دەکرد، خەڵکی (قوباء) دەهاتنە لای، ئەوانیش خێڵی بەنوعەوفی کوڕی حارث بوون، لە کاتی نوێژدا سڵاویان لێدەکرد، ئەویش دەستی بۆ ڕادەوەشاندن.[1]

کە دەچوو بۆ (قوباء) خەوی قەیلولەی لای ئوم حەرام بوو؛ کە کچی سەلمانی خوشکی ئوم سولەیم و، هاوسەری عەبادەی کوڕی صامت بوو -ڕەزای خوای لێ بێت-، هەروەها یەکێك بوو لە مەحرەمەکانی پێغەمبەر ﷺ.

ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ لای، تا سەری بۆ بشێلێت و، لەو میانەیەدا خەوبردیەوە، هەر کە لە خەو هەستا پێدەکەنی، ئوم حەرام وتی: چی دەتخاتە پێکەنین، پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: **"خەڵکانێکی میللەتی من هەن پیشانم دران کە لە پێناوی خوادا دەجەنگێن، بە سواری شەپۆلی ئەو دەریایە گەشت دەکەن و، وەك پاشا لەسەر تەخت دادەنیشن"**. ئوم حەرام وتی: پێغەمبەری خوا،

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١١٩١، ١١٩٣. صحيح مسلم: ١٣٩٩.



دوعام بۆ بکە کە من یەکێك بم لەوانە، پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ کرد، پاشان سەری نەوی کردەوە و، هەستایەوە بەڵام هێشتا پێدەکەنی، ئوم حەرام وتی: چی دەتخاتە پێکەنین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"خەڵکێکی میللەتی خۆمم نیشاندرا لە پێناوی خوادا دەجەنگێن و بە سواری شەپۆلی دەریا گەشتیان دەکرد"**. ئوم حەرام وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دوعام بۆ بکە یەکێك بم لەوانە. فەرمووی: **"تۆ لە یەکەمینەکانی ئەوان دەبیت"**. ئەوە بوو لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیاندا -ڕەزای خوای لێ بێت- لەگەڵ سوپای موسوڵمانان سواری کەشتی دەریا بوو، کاتێ دابەزی بە سواری وڵاخەکەیەوە کوژرا و بە شەهیدی سەری نایەوە -ڕەزای خوای لێ بێت-.[1]

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٢٧٨٨، ٧٠٠١. صحيح مسلم: ١٩١٢.



# دەمەونیوەڕۆی پێغەمبەر ﷺ



کە خۆر لاردەبووەوە بیلال بانگی نیوەڕۆی دەدا، پێغەمبەر ﷺ لە قەیلولەکەی بەخەبەر دەهات ئەگەر بخەوتایە و، وەك خۆی وەڵامی بانگدەرەکەی دەدایەوە، ئەگەر پێویستی بەدەست نوێژ بوایە دەیگرت، پاشان لە ماڵەکەی خۆیدا چوار ڕکات نوێژی دەکرد و،[1] دەیفەرموو: **"ئەمە کاتێکە دەرگاکانی ئاسمانی تێدا دەکرێتەوە، پێم خۆشە لەو کاتەدا کردەوەی باشم هەبێ و بەرزبێتەوە"**.[2]

جا لەماڵەوە چاوەڕوانی نوێژی دەکرد، لەوانە بوو لەو کاتەدا هەندێ لە ڕۆڵەزاکانی لە لای بن وەك حەسەن و حوسەین هەردوو کوڕی فاطمە، یان ئومامەی کچی زەینەب، گەمەوگاڵتەی لەگەڵدا دەکردن، هەتا بیلال بانگی دەکرد ئەنجا بۆ نوێژەکەی دەچووەدەرەوە.

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٧٣٠.

٢- مسند أحمد، رقم الحديث: ٢٣٥٥١، جامع الترمذي: ٤٧٨.



هەندێ جار لەکاتی چوونەدەرەوەدا بۆ نوێژ یەکێك لە ژنەکانی ماچ دەکرد.[1]

کاتێ دەچووە دەرەوە بیلال -ڕەزای خوای لێ بێت- قامەتی دەکرد کە هاوەڵانیش دەیان بینی ئەوانیش هەڵدەستان.

هەندێ جار کە حەسەن و حوسەینی بەسەر شانەوە بوو، یان هەندێ جار ئومامەی کچەزای هەڵدەگرت هاوەڵانی سەرسام دەکرد بەو دیمەنە، هەندێ جاریش منداڵەکەی لە پاڵ خۆیدا دادەنا و نوێژەکەی دەکرد.

بۆ نموونە:

جارێکیان حەسەن یان حوسەینی هەڵگرتبوو چوو بۆ نوێژ، ڕۆشتە پێشەوە منداڵەکەی دانا، پاشان نوێژی دابەست و دەستی پێکرد، لەناو نوێژەکەیدا سوژدەیەکی درێژی برد، شیدادی کوڕی هاد -ڕەزای خوای لێ بێت- سەری بەرزکردەوە بینی منداڵەکە بەسەر پشتی پێغەمبەرەوەیە ﷺ لەکاتی سوژدەدا، کە پێغەمبەر ﷺ نوێژەکەی تەواو کرد خەڵکەکە وتیان:

پێغەمبەری خوا، تۆ سوژدەیەکی درێژخایەنت برد، هەتا گومانمان برد شتێك ڕوویدابێت، یان نیگات بۆ هاتبێت! فەرمووی:

---

١- مسند أحمد، رقم الحديث: ٢٥٧٦٦. سنن أبي داود: ١٧٩.



"هیچ یەکێك لەوانە ڕووی نەدا، بەڵکو کچەزاکەم سواری کۆڵم بوو بوو، پێم ناخۆش بوو پەلەی لێ بکەم هەتا کاری خۆی دەکات و دێتە خوارەوە".[1]

هەندێ جار منداڵەکە لەسەر شانی بوو نوێژەکەی دەکرد، کە دەچووە کڕنووش دایدەنا کە ڕاست دەبووەوە هەڵی دەگرتەوە، نموونەی ئەمەش ئەو جارە بوو کە ئومامەی کچی زەینەبی بەباوەشەوە بوو -ڕەزای خوای لێ بێت-.[2]

نوێژی نیوەڕۆی لە سەرەتای کاتەکەیدا دەکرد، بە ئەندازەی سی ئایەتی لە دوو ڕکاتی یەکەمدا دەخوێند.[3]

هەندێ جار درێژی دەکردەوە، بە ئەندازەی ئەوەندەی کە نوێژ دادەبەسترا، کەسێك دەچووە (بەقیع) بۆ دەست بە ئاو گەیاندن و، دەچووە ماڵەوە بۆ دەست نوێژ، پاشان دەهاتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا هێشتا لە ڕکاتی یەکەمدا بوو، واتە ئەوەندەی پێدەچوو.[4]

---

١- مسند أحمد، رقم الحديث: ١٦٠٣٣، ٢٧٦٤٧، سنن النسائي:١١٤١.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥١٦. صحيح مسلم: ٥٤٣.

٣- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٦٠، ٥٦٥. صحيح مسلم: ٤٥٢، ٦١٨، ٦١٩، ٦٤٦.

٤- القراءة خلف الإمام للبخاري: ٢٤٣. صحيح مسلم: ٤٥٤.



لـە ڕکـاتی یەکەمـدا بـە نهێنـی قورئـانی دەخوێنـد، بـە هـۆی جولانـەوەی ڕیشـی پیرۆزیـەوە، دەیـانزانی کـە قورئـان دەخوێنێـت، لەوانە بوو هەندێ جار گوێیان لە ئایەتێك یان چەند ئایەتێك بووبێت.[1]

کـە لەنوێـژ دەبـووەوە ڕووی دەکـردە هاوەڵـەکانی، ئەگـەر لـەو کاتەدا شتێك ببوایە یان ڕووداوێك بهاتایـە پـێش دوای نوێـژی نیـوەڕۆ وتاری بۆ دەدان، چـونکە کـاتی کۆبوونـەوەی خـەڵك بـوو، هـەموو لـە خەوی قەیلولە هەستابوون، گردبوونـەوەیان لەوێـدا زۆرتـر بـوو، دڵ و دەروونیان بێدار و هۆشیار بوو بۆ گوێ گرتن.

**نموونەیەکی تر لەوانە:**

ئەو وتارەی کە لە ڕۆژی هاتنی شاندی موضرییەکاندا، کاتێ بینی کـە چـەند هـەژار و کەمدەسـتن، پـاش نوێـژی نیـوەڕۆ وتـارێکی دا، سوپاسـی خـودای کـرد، وەسـف و سـەنای کـرد، پاشـان فـەرمووی: "**پاشان، خودا لە پەڕاوەکەیدا فەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾** النساء:١،

واتە: (ئەی ئادەمزادینە ! لە خودای خۆتان بترسن، ئەو خودایەی ئێوەی لە نەفسێکی تەنیا، کە ئادەمە، دروست کردوەو، هـەر لـەویش

---

[1] صحیح البخاري، رقم الحدیث: ٧٤٦، ٧٥٩، ٧٦٠، ٧٦٢. صحیح مسلم: ٤٥١.



هاوجووتەکەیی دروست کردوەو، لەم دوانەوە پیاوان و ژنانی زۆری دروست کردوەو بڵاوبوونەتەوە. لەو خودایە بترسن کە بە ناوی ئەوەوە لەناو خۆتاندا داوای شت لە یەکتر ئەکەن، بۆ نموونە: ئەڵێن توخودا فڵانە شتم بدەرێ، فڵانە ئیشم بۆ جێبەجێ بکە. هەروەها خزمایەتی ڕاگرن و مەیپچڕێنن. بێگومان خودا ئاگای لێتانەو ئەتانپارێزێ.)

**هەروەها ئایەتی:** ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ الحشر:١٨، واتە: (ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە! لە خوا بترسن و، با هەرکەسێ سەرنج بدا چیی لەپێش خۆیەوە ئامادە کردووە بۆ سبەینێی و لە خوا بترسن، بەڕاستی خوا خەبەردارە لە هەرچییەك.)

جا پیاوێك دینارێکی کردە خێر و، کەسێکی دیکە درهەم و، کەسێکی دیکە جامێ گەنم و، کەسێکی دیکە جامێ خورما، هەتا فەرمووی: **"با بە لەتە خورمایەکیش بێت"**، ئەوە بوو خەڵکی هاندا بۆ چاکەکردن و ئارەزووی خێری تێدا دروست کردن.[1]

نموونەیەکی تر لەوانە: وتارەکەی ئەو ڕۆژەی کە (ئیبنول لوتبییە) هات بۆ لای -ڕەزای خوای لێ بێت- ئەم پیاوە کاری کۆکردنەوەی سەدەقەی لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ پێ سپێردرا

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ١٧٥٣.



بوو، وتی: پێغەمبەر ﷺ ئەمە بۆ ئێوەیە، ئەوەشیان دیاریە و بۆ خۆم هاتووە، پێغەمبەر ﷺ دوای نوێژ هەستا وتاری خوێندەوە بۆ خەڵك، پاش سوپاس گوزاری خودا پاشان فەرمووی:

"پاشان، کاتێ من یەکێك لە ئێوە دادەنێم لەسەر کارێك لەوەوەیە کە خودا سەرپشکی کردووم، کەچی دێتە لام و، پێم دەڵێ، ئەمە بۆ ئێوەیە و ئەمەش دیاریە و بۆ خۆم هاتووە، جا بۆ ناڕوات لە ماڵی باوك و دایکی دانیشێ بزانێ دیارییەکەی بۆ دەڕواتەوە ماڵەوە، سوێندم بە خودا، هیچ کەسێك لە ئێوە نیە شتێك بە ناهەق هەڵبگرێت، مەگەر لە ڕۆژی قیامەتدا کە دەگات بە خودا لە گەردنیدا نەبێت، کەسێك لەئێوە دەناسم، لەو ڕۆژەدا کە بە خودای خۆی دەگات، وشترێکی داوەتە بەر خۆی، یان مانگایەکی بە بۆڕەوە وەپێش خۆی داوە، یان ملی مەڕێکی بە باڕە بارەوە گرتووە و بۆ لای خوا دەچێت".

پاشان دەستی بەرزکردەوە بۆ نزا هەتا ئەوەندەی سپێنەی بن باڵی دەرکەوت و دەیفەرموو: "خودایە پێم ڕاگەیاندن؟".[1]

جارێکیان نوێژی نیوەڕۆی کرد، کە سڵاوی دایەوە تەشریفی چوە سەر مینبەرەکەی باسی هاتنی ڕۆژی دوایی کرد، باسی ئەوەشی کرد کە پێش ئەوە شتی گەورە ڕوودەدات، پاشان فەرمووی: "هەرکەسێك

---

١- صحیح البخاري، رقم الحدیث: ٢٥٩٧، ٦٦٣٦. صحیح مسلم: ١٨٣٢.



حەز دەکات پرسیاری هەرشتێکم لێ بکات، با بیکات، سوێندم بە خودا پرسیاری هیچ شتێکم لێ ناکەن وەلامتان نەدەمەوە، هەتا من لەم شوێنەدا بم".

خەڵك بە کوڵ گریان، پێغەمبەریش ﷺ چەند جارێك فەرموویەوە، پرسیارم لێ بکەن، عەبدوڵڵای کوڕی حوزافە -ڕەزای خوای لێ بێت- وتی: پێغەمبەری خوا، کێ باوکی منە؟ فەرمووی: "حوزافەیە"، پاشان کە پێغەمبەرﷺ چەند جار فەرمووی پرسیار بکەن، عومەر هەڵوێستەیەکی کرد و وتی: ڕازی بووین کە خودا پەروەردگارمان بێت و ئیسلام ئاینمان و محمدیش پێغەبەرمان بێت، کە عومەر ئەو ڕستانەی وت: پێغەمبەرﷺ بێدەنگ بوو، پاشان فەرمووی:

"های کە نزیکە سزای خوا، سوێندم بەوکەسەی گیانی محمدی بەدەستە پێشتر بەهەشت و دۆزەخم پیشاندرا لە پانایی ئەو دیوارەدا، هیچ ڕۆژێکم نەدیوە، وەك ئەمڕۆ بێت لە چاکە و خراپەدا، خۆ ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە، کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان."

ڕۆژێکی لەوە سەختتر نەهات بەسەر هاوەڵاندا، سەریان داپۆشیبوو شینیان دەکرد لە خەفەتدا.[1] هەروەکو چۆن ئەو وتارانە

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٩٢، ٥٤٠، ٧٠٨٩. صحيح مسلم: ٢٣٥٩.



لەکاتی ڕوودانی شتێك یا مەسەلەیەکی خێردا بووبن کە نەدەکرا دوا بخرێن بۆ ڕۆژی هەینی.

پاشان پێغەمبەرﷺ دەگەڕایەوە ماڵەکەی خۆی، دووڕکات نوێژی سوننەتی نیوەڕۆی دەکرد. پاشان دەڕۆیشتەوە دەریێ بۆلای هاوەڵەکانی.

هەندێ جار لەگەڵیان دادەنیشت هەتا نوێژی عەسر، هەروەك جارێکیان خۆی هێلایەوە (نوێژی نیوەڕۆ هەتا عەسر) چاوەڕوانی شاندەکەی (عەبدول قەیس) بوو.

هەندێ جاریش لەوکاتەدا دەچوو بەدەم کاروباری موسوڵمانانەوە، جارێکیان هەواڵی پێگەیشت لە لایەن خەڵکی قوبائەوە –کە بەنو عەمری کوڕی عەوف بوون– شەڕ لە نێوانیاندا ڕوویدا بوو، لە یەکتریان دابوو هەتا گەیشتبووە شەڕە بەرد، نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان بە هاوەڵەکانی فەرموو: **"با پێکەوە بڕۆین تا ئاشتیان بکەینەوە"**. فەرمووی بە بیلال –ڕەزای خوای لێ بێت–: **"کە نوێژی عەسر هات فەرمان بدە با ئەبوبەکر نوێژ بۆ خەڵکەکە بکات"**.

کە کاتی عەسر هات بیلال بانگی دا، کە کاتی نوێژ هات بۆ لای ئەبوبەکر وتی: ئەبوبەکر پێغەمبەرﷺ دەستی بەکارێکەوە گیراوە و ئێستا کاتی نوێژە، ئایا دەکرێ پێشەوایەتی نوێژ بۆ خەڵکی بکەیت؟ وتی: ئەگەر بتەوێ بەڵێ.



بیلال قامەتی کرد و ئەبوبەکر چووە پێشەوە، نوێژی دابەست و موسوڵمانانیش نوێژیان دابەست، پێغەمبەریش ﷺ گەڕایەوە چووە ناو ڕیزەوە و وەستا، نوێژکەران حەپەسان، ئەبوبەکر نەریتی وابوو لە کاتی نوێژدا لای نەدەکردەوە کە دەنگی چەپڵەی دەستەکان زۆر بوون ئەنجا لای کردەوە، بینی پێغەمبەر ﷺ لە ڕیزدا وەستاوە، دەیویست بێتەوە دواوە، پێغەمبەر ﷺ بەدەست ئاماژەی بۆ کرد کە لەشوێنی خۆت بمێنەرەوە، ئەبوبەکر دەستی بەرز کردەوە، سوپاسی خودای کرد و هاتە دواوە تا چووە ڕیزەکەوە، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ چووە پێشەوە و نوێژەکەی بۆ کردن، کە تەواو بوون، ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی:

"خەڵکینە ئەوە چیتانە کەشتێکتان لێ دەقەومێ لەکاتی نوێژدا دەست دەکەن بە چەپڵە لێدان، چەپڵە لێدان بۆ ژنانە، کە شتێك ڕوویدا لێتان لەکاتی نوێژدا بڵێن (سبحان الله)، هەر کەسێك گوێی لە (سبحان الله) بێت لادەکاتەوە، ئەرێ ئەبوبەکر کە ئاماژەم بۆ کردیت چی وای لێ کردیت نوێژنەکەیت بۆ موسوڵمانان؟" ئەبوبەکر وتی: نابێ کوڕی ئەبو قوحافە لە پێش پێغەمبەری خواوە نوێژ بکات ﷺ.[1]

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١٢١٨، ٧١٩٠. صحيح مسلم: ٤٢١.



**نموونەیەکی تر:**

ڕۆیشتنی بۆ ناوچەی ئەسواف، کە شوێنێکە نزیک (بەقیع) لە مەدینە، چوو بۆ سەردانی کچانی سەعدی کوڕی ڕەبیع، بۆ ئەوەی میراتی باوکیان دابەش بکات بەسەریاندا، ئەو کچانە یەکەمین ژنان بوون کە لە ئیسلامدا میراتیان لە باوکیانەوە بۆ بەجێما.

چێشتەنگاو چوو بۆ لایان، خواردنی نیوەڕۆ گۆشت و نانیان بۆ هێنا، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئامادەبووان نانیان خوارد، پاشان دەستنوێژی نیوەڕۆی گرت و خەڵکیش دەستنوێژیان گرت لەگەڵیدا، پاشان نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردن، پاشان ئەوەندەی مابوو لایان مایەوە هەتا کاتی نوێژ هات و کارەکەی ئەوانی تەواوکرد، ئەنجا پاشماوەی خواردن چیمابوو هێنایانەوە خۆی و ئامادەبووان لێیان خوارد، پاشان هەستا نوێژی عەسری بۆ کردن و نە خۆی و نە ئامادەبووان دەست نوێژیان نەگرتەوە.[1]

---

١- مسند أحمد، رقم الحديث: ١٤٧٩٨، ١٥٠٢٠. سنن أبي داود: ٢٨٩١، ٢٨٩٢.



# نوێژی عەسران



كاتێ بانگ بدرایە بۆ نوێژی عەسر، چاوەڕوانی دەكرد هەتا خەڵكی كۆدەبوونەوە، حەزی لە چوار ڕكاتی پێش نوێژی عەسر بوو، دەیفەرموو: **"خودا ڕەحم بكا بەو كەسەی چوار ڕكاتی پێش نوێژی عەسر دەكات".**[1]

كە خەڵكی كۆدەبوونەوە، دەچووە دەرەوە بۆ لایان و نوێژی عەسری بۆ دەكردن، تا كاتێك خۆر گەرم بوو نوێژی بۆ دەكردن، تەنانەت ئەنەس -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێت: "كەسێك نەبووە خێراتر بێت لە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی عەسردا".[2]

قورئان خوێندنی لە نوێژی عەسراندا نیوئەوەندەی قورئان خوێندنی بوو لە نوێژی نیوەڕۆدا.

كە لە نوێژەكە دەبووەوە ڕووی دەكردە هاوەڵانی، ئەگەر باسێك هەبوایە دەیكردەوە لەگەڵ هاوەڵانیدا، جارێكیان دوای تەواو بوونی نوێژی عەسر ڕووی كردە هاوەڵانی فەرمووی: **"نازانم باسی شتێكتان**

---

١- مسند أحمد، رقم الحديث: ٦٥٠، ١٣٧٥، ٥٩٨٠. سنن أبي داود: ١٢٧١.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٤١، ٥٩٩، ٥٦٠، ٥٦٥. صحيح مسلم: ٦٤٦، ٦٤٧.



**بۆ بکەم یان بێدەنگ بم!"** وتیان: پێغەمبەری خودا ئەگەر خێرێکی تێدایە بۆمان باس بکە، ئەگەر نا ئەوە خوداو پێغەمبەری باشتر دەزانن، فەرمووی: **"موسوڵمانێك نیە خۆی پاك بکاتەوە، پاککردنەوەیەکی پێویست، پاشان پێنج نوێژەکە بکات، مەگەر ئەوانە دەبنە مایەی، سڕینەوەی گوناهەکانی".**[1]

جارێکیان نوێژی عەسری کرد، پاشان هەستا و قسەی بۆ کردن، بەشێك لە وتەکانی دەفەرموێت: **"کەسێك نیە دەستنوێژ بگرێت و باش بیگرێت و پاشان بڵێت (أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمداً عبده و رسوله) مەگەر هەشت دەروازەکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە و لەکامیانەوە حەزی لێ بێت دەڕواتە ژوورەوە، موسوڵمانێك نیە دەستنوێژ بگرێت، باش بیگرێت، پاشان هەستێ و دوو ڕکات نوێژبکات بە دڵ و گیان ڕووی تێبکات، مەگەر بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت".**[2]

وتارەکانی بۆ هاوەڵانی لەدوای نوێژی عەسر کەمتربوو لە وتارەکانی دوای نوێژی نیوەڕوان، لەبەر شەکەتی خەڵك و پێویستیان بۆ تەواوکردنی کارەکانیان و ئامادەکردنی نانی شێوان.

که لەنوێژی عەسر دەبووەوە دەچووەوە بۆ لای خێزانەکانی و بەسەریاندا دەگەڕا بە تەواوی، لەکاتی دانیشتندا لە هاوسەرەکانی

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٣١.

٢- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٣٤.



نزيك دەبووەوە و ماچی دەکردن و دەستبازی لەگەڵ دەکردن بێ ئەوەی کاری ژن و مێردایەتیان لەگەڵدا بکات، تا ئەو کاتەی کە دەهات بۆ لای ئەو ژنەی کە ڕۆژە سەرەی خۆی دەبوو، ئیتر لای ئەوەیان شەو دەمایەوە.[1]

هەندێ جار هەموویان لای ئەو ژنەیان دەمانەوە کە پێغەمبەری لێ بوو ﷺ ئەمەش لەکاتەکانی ڕۆژکورتیدا بوو، چونکە کاتی عەسران دەرفەت نەبوو بەسەر هەموویان بگەڕێت، لەبەر ئەوە هەموویان لە ماڵی ئەو ژنە کۆدەبوونەوە کە سەرە ڕۆژی خۆی بوو پێغەمبەریش لەوێ بوو.

بۆ نموونە: جارێکیان لە ماڵی عائیشە کۆبوونەوە -ڕەزای خوای لێ بێت- زەینەبیش -ڕەزای خوای لێ بێت- هات کە پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە، دەستی برد بۆ زەینەبی هاوسەری -ڕەزای خوای لێ بێت- عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێت- وتی: ئەوە زەینەبە، چیدی پێغەمبەر ﷺ دەستی کێشایەوە، زەینەب و عائیشە کەوتنە قسەوتن بەیەك و، لەوناوە دەنگیان بەرزبووەوە، خەریك بوو نوێژ ئەنجام دەدرا، ئەبوبەکر -ڕەزای خوای لێ بێت- بەوێدا تێپەڕی گوێی لە دەنگەدەنگی هەردووکیان بوو، وتی: پێغەمبەری خوا تەشریف بێنە دەرەوە بۆ نوێژ و، قوڕ بدە بەدەمی هەردووکیاندا،

---

١- مسند أحمد، رقم الحديث: ٢٤٧٦٥. سنن أبي داود: ٢١٣٥.





پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە بۆ نوێژ، عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێت- وتی: ئێستا هەر کە پێغەمبەر ﷺ لەنوێژەکەی بووەوە، ئەبوبەکر یەت و واو و وام پێدەڵێ، کاتێک پێغەمبەر ﷺ لە نوێژەکەی بووەوە، ئەبوبەکر هات بۆ لای عائیشە و قسەی توندی پێ وت، وتی: چۆن تۆ ئەمە دەکەیت؟[1]

که پێغەمبەر ﷺ دوای نوێژی عەسر بهاتایەوە ماڵەوە دووڕکات نوێژی دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا کە نەهی کردبوو دوای نوێژی عەسر نوێژی دیکە بکرێ، ئەوەش لەپاش ئەوەوە بوو کە جارێکیان شاندێکی عەبدولقەیس لە لایەن کەسوکاریانەوە بە ئایینی ئیسلامەوە هاتبوون، سەریان قاڵ کرد و نەیتوانی دوو ڕکات نوێژی پاش نوێژی نیوەڕۆ بکات، بۆیە دوای عەسر جارێکی تر گێڕایەوە، پاشان جێگیری کردن، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەر نوێژێکی بکردایە جێگیری دەکرد، تەنانەت عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێت: سوێندم بەو کەسەی گیانی ئەوی بردەوە، ئەو دوو ڕکاتەی دوای نوێژی عەسری وازلێنەهێنا هەتا بە خودای خۆی گەیشت.[2] زۆر جار ماوەی دوای عەسری لەماڵەوە و لەگەڵ ژنەکانیدا بەسەر دەبرد.

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ١٤٦٢.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٨٦، ٥٨٧، ٥٩٠-٥٩٣، ١٢٣٣، ١٦٣١. صحيح مسلم: ٨٢٥، ٨٣٤، ٨٣٥.






هەروەکو لە دیوەخانیدا لەگەڵ هاوسەرەکانیدا ژیانی خۆشی بەسەر دەبرد، هاوکات لێپرسینەوە و پرسیار و گرفتی زانستی دەخرایە ڕوو، پێغەمبەر ﷺ هەموو ئەوانەی بەسنگ فراوانی وەردەگرت، دەبینین عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێت- پرسیاری ناخۆشترین ڕۆژی لێ دەکات کە لە کاتی بانگەواز و خەباتی خۆیدا بەسەریدا هاتبێت، دەڵێت: پێغەمبەری خودا ئایا ڕۆژێکی سەختترت بەسەردا هاتووە خراپتربێت لە ڕۆژی ئوحود؟ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:

"لە لایەن کەسوکاری تۆوە زۆرم بینی، خراپترین شتێك لەوانم بینی ڕۆژی عەقەبە بوو، باسی خۆمم کرد بۆ (ئیبنو عەبدو یالەیلی کوڕی کولال) بەدەمەوە نەهات بۆ ئەوەی ویستم، بە خەمبارییەوە دەرچووم تا چاوم کردەوە، دەبینم گەیشتومەتە (قەرنولثەعالب)، سەرم بەرزکردەوە، دەبینم هەورێك سێبەری بۆ کردووم، سەیرم کرد، (جوبرەئیل)ی تێدا بوو، هاواری لێ کردم: خودای گەورە گوێی لێبوو کەس و کارت چییان پێ وتیت و وەڵامیان چی بوو، ئەوە فریشتەی شاخەکانی ناردوە بۆ لات، بۆ ئەوەی فەرمانی پێ بکەیت هەرچیەکیان لێ بکات، دەفەرموێت: "فریشتەی شاخەکان بانگی کردووم و، سڵاوی لێ کردم، پاشان فەرمووی: هۆ محەمەد، خودا گوێی لێ بوو گەلەکەت چییان پێ وتیت، پەروەردگارت منی ناردووە بۆ لای تۆ، هەتا فەرمانم پێ بدەیت چیت ویست، ئەگەر ویستت ئەو





**دوو شاخە دادەهێنمەوە بەسەریاندا"، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "نا بەڵکو من ئومێدم وایە کە لە پشتی ئەمانە کەسانێك دروست ببن تەنها خودا بپەرستن و هاوڕێی بۆ بڕیار نەدەن".**[1]

گفتوگۆ لەگەڵ عائیشەی هاوسەریدا دەکات و دەفەرموێت: **"ئەو کەسەی لە ڕۆژی قیامەتدا دادگایی و لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت ئەشکەنجە دەدرێت".**

عائیشە نەریتی وا بوو گوێی نەدەدایە شتێك کە نەیزانیایە هەتا بۆی دەگێڕایەوە و دەیزانی، بۆیە لەسەر ئەمەش پرسیار و گفتوگۆیەکی کرد لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و وتی: باشە ئەوە نیە کە خودا کە فەرموویەتی: ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَاباً يَسِيراً﴾ الانشقاق:٨، واتە: (ئەوە لەوەپاش بە ئاسانی لێی ئەپرسرێتەوە)، فەرمووی:

**"ئەوە لێپرسینەوە نیە، بەڵکو پیشاندانە هەرکەسێك لێ پرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت لەڕۆژی قیامەتدا ئەشکەنجە دەدرێت."**[2]

جارێکی تریش قسەی لەگەڵ حەفصەی هاوسەریدا دەکرد – ڕەزای خوای لێ بێت– و فەرمووی:

**"تکام وایە لای خوا ئینشەڵڵا کە ئەوانەی شەڕی بەدر و حودەیبیەیان بینی نەڕۆنە دۆزەخەوە. حەفصە –ڕەزای خوای لێ**

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٣٢٣١. صحيح مسلم: ١٧٩٥.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١٠٣، ٦٥٣٧. صحيح مسلم: ٢٨٧٦.





بێت– وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی ئەوە نیە خودا فەرموویەتی:
﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْماً مَّقْضِيّاً﴾ مریم:٧١، واتە:
کەسێك نییە لە ئێوە نەڕواتە سەر دۆزەخ، ئەوە بڕیارێکی یەکلاکەرەوەی کۆتاییە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :

"ئەی نەت بیستوە کە فەرموویەتی:

﴿ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيّاً﴾ مریم:٧٢، واتە : (پاشان ئێمە لە خوا ترسان ڕزگار دەکەین و ستەمکارانی بە ملکەچی تێدا دەهێڵێتەوە) ".[١]

ئەم پێداچوونەوەیە لەنێوان پێغەمبەر ﷺ و هاوسەرەکانیدا دروست نەدەبوو ئەگەر ئەو هۆش و عەقڵیانی نەبزواندبایە و، ئاسۆکانی بیرکردنەوەی بۆ نەکردنایەتەوە کارلێکردنێکی عەقڵی دروست نەبوایە لە ڕێگەی باوەڕ پێ کردن و بڕوای تەواوەوە.

هەندێ جار هاوەڵان دوای نوێژی بانگیان دەکرد بۆ کارێك حەزیان دەکرد لەو کاتەدا لەگەڵیاندا بێت، ئەویش دەچوو بۆ لایان، جارێکیان پیاوێکی خێڵی (بەنو سەلەمە) دوای نوێژی عەسر بانگهێشتی کرد، وتی:

پێغەمبەری خوا ﷺ دەمانەوێ هەندێ وشتری خۆمان بکەینە قوربانی حەز دەکەین تۆش ئامادە بیت، ئەمە بۆنەیەکی خۆشیشە،

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٤٩٦.



چونکه ئـەو کاتـه گۆشـتیان کـەم بـووه، پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: "باشه".

خۆی و هەندێ لە هاوەڵانی ڕۆشتن، بینیان که هێشتا وشـترەکان نەکراونەتە قوربانی، سەربڕان، پاشان پارچە پارچەکران و لێ نران و، کران بە خواردن، پێش ئەوەی خۆرئاوابێت لێیان خوارد.[1]



١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٦٢٤.



# پاش مەغریب



کە بانگی خۆرئاوابوون بدرایە، زۆری نەدەبرد و دەچووە دەرەوە بۆ نوێـژ، کـە دەڕۆیشـت هـاوەڵانی دەبینـی لـە نزیـك پایـەکانی مزگەوتەکەوە دوو ڕکات نوێژی خۆرئاوا بوون دەکەن، چونکە خـەڵکی ماندەدا بۆ ئەو دوو ڕکاتەو دەیفەرموو: **"پێش نوێـژی مـەغریب نوێـژ بکەن، پێش نوێژی مەغریب نوێـژ بکـەن"** پاشـان لـە سـێیەم جـاردا فەرمووی: **"بۆ هەرکەسێك بیەوێت"** ئەو نوێژە دوو ڕکاتی سوکەڵەن، چونکە نێوان کاتی بانگی مەغریب و قامەت کردن زۆر کورت بوو.[1]

کە چووە دەرەوە قامەت کرا و نوێـژی مـەغریب ئەنجامـدرا، ئـەو نوێژەی لەسەرەتای کاتەکەیدا دەکرد، پێش تاریك بـوون بـڵاوەی لـێ دەکـرد، بەشـێوەیەك ئەوەنـدە ڕووناك بـوو ئەگـەر کەسـێك تیرێکـی بهاوێشتایە شوێنی کەوتنە خوارەوەی تیرەکەی دەبینی.[2]

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٠٣، ٦٢٥، ١١٨٣، ٧٣٦٨. صحيح مسلم: ٨٣٧.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٥٩. صحيح مسلم: ٦٣٧



زۆرجار نوێژ و قورئان خوێندنەکەشی تیایدا کورت بوون، هەندێ جار درێژی دەکردەوە، جارێکیان سورەتی (الاعراف)ی خوێند و جارێکی تریش سورەتی (الطور)ی خوێند و جارێکیش (المرسلات).[1]

لەدوای نوێژی مەغریب وتاری نەدەدا درك لە دوای نوێژەکانی تری ئەو کارەی دەکرد، لەبەر بڵاوەکردنی خەڵك بۆ نانی شێوان و حەوانەوەیان.

پاش ئەوەی نوێژی مەغریبی دەکرد دەڕۆیشتەوەماڵەوە، دوو ڕکات نوێژی سوننەتی پاش مەغریبی دەکرد، پاشان نانی شێوانی دەخوارد، کە زۆربەی کات ئەوە کاتی شێوخواردن بوو، ئەگەر بەڕۆژوو بوونایە پێشیان دەخست بۆ ڕۆژوو شکاندن، بۆیە دەیفەرموو: **"نانی ئێوارەتان دوامەخەن"**.[2]

هەروەها فەرمانی دەدا بە هاوەڵەکانی کە هەژارانی موسوڵمانان بەشداربکەن لە نانی ئێوارەدا و دەیفەرموو: **"کێ خواردنی دووکەسی هەیە، با سێیەمیش بباتەوە، ئەو کەسەش خواردنی سیانی هەیە، با چوارەمیش بباتەوە."**[3]

هەندێ جار پێغەمبەر ﷺ دە کەسی دەبردەوە ماڵەوە، بۆ ئەوەی نانی ئێوارەیان لەگەڵدا بخوات، ئەمە لەکاتێکدا کە خواردنی

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٧٦٣-٧٦٥. صحيح مسلم: ٤٦٢، ٤٦٣.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦٧٢. صحيح مسلم: ٥٥٧-٥٥٩.

٣- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦٠٢، ٣٥٨١. صحيح مسلم: ٢٠٥٧.



زیادەی ببوایە، هەندێ جاریش کە دەگەڕایەوە ماڵەوە جگە لـە ئـاو و خورما چیتریان نەبوو هەندێ جاریش چەند ڕۆژێك دەگوزەرا شتێك لە ماڵەکەیدا نەبوو بەری دڵ بگرێت.[1]

خواردنی لەسەر سفرەیەك لە زەویدا بۆ دادەنـرا، هـەرگیز لەسـەر مێز و هاوشێوەکانی خواردنی نەدەخوارد.[2]

کـە خواردنەکـەی لـێ نزیـك دەکرایـەوە، دەیفـەرموو: **"بـەناوی خـودا"**. لـە لای خۆیـەوە دەیخـوارد، فـەرمانی دەدا لـە چـواردەوری خواردنەکە بخۆن و سەرتۆپەکەی بهێڵنەوە.[3]

لە خواردنـدا زۆری لـە خـۆی نـەدەکرد، چـەند بکرایـە ئەوەنـدەی دەخوارد و پرسیاری دەکرد لە خێزانەکانی: **"ئەرێ ئێوە هیچتان لـە لایـە؟"** لەوانـەبوو بیانگوتایـە: هیچـمان نیـە، لەوانـەبوو بڵـێن: تـەنها سرکەمان هەیە، دەیفەرموو: **"کە خواردنێکی خۆشە سرکە"**. هەرگیز توانجی لە خواردن نەداوە، ئەگەر حەزی لێبوایە دەیخوارد و، گـەر نـا وازی لێدەهێنا.[4]

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٢٥٦٧، ٣٠٩٧، ٥٣٨٣، ٦٤٥٩. صحيح مسلم: ٢٩٧٢-٢٩٧٥

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٣٨٦.

٣- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٠٣١-٢٠٣٥.

٤- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٠٥١، ٢٠٥٢، ٢٠٦٤.



کــە لەســـەر خواردنێــك دادەنیشــت لەگــەڵ هاوەڵەکانیــدا، دانیشــتنەکەی بــێ قســەی خــۆش یــان باســێکی پەنــد ئــامێز یــان بڵاوکردنەوەی زانیارییەك نەبوو.

نموونەیەك لەوانە: عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە -ڕەزای خوای لێ بێت- کە مێردمناڵێك بوو و لە ماڵەکەی پێغەمبەردا ﷺ دەژیا، کوڕی مێردەکەی پێشووی خاتوو ئومو سەلەمە بوو -ڕەزای خوای لێ بێت- لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نانی دەخوارد، دەستی دەهاویشت بۆ سەر خواردنەکە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: **"کوڕەکەم ناوی خودا بهێنە، بەدەستی ڕاست بخۆ، لای خۆتەوە بخۆ"**. عومەر -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێ: لە دوای ئەو ئامۆژگاریەوە نان خواردنم بەو شێوەیە بوو.[1]

جارێکیان خواردنێکی پڕ لە ئاو و گۆشت خرایە بەردەم پێغەمبەر ﷺ لە باڵی مەڕەکەی خوارد، ئەوە خۆشترین بەشی گۆشتی مەڕ بوو لە لای، پلەگۆشتێکی هەڵگرت و خواردی، فەرمووی: **"من گەورەی خەڵکم لە ڕۆژی قیامەتدا"**. پاشان گازێکی تری گرت لە گۆشتەکە و فەرمووی: **"من گەورەی خەڵکم لە ڕۆژی قیامەتدا"**. کە بینی کەس پرسیاری لێ ناکات، فەرمووی: **"ئەرێ ناپرسن، چۆن؟"**

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٣٧٦. صحيح مسلم: ٢٠٢٢.



**وتیان: ئەوە چۆنە پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: "خەڵكان هەڵدەستن بەرەو لای پەروەردگاری جیهانیان".** [1]

که لە خواردنەکەی دەبووەوە، پەنجەکانی خۆی دەلستەوە، فەرمانی دەدا که دەفرەکە بە پەنجە پاك بکەنەوە و هەمووی بخۆن، دەیفەرموو: **"ئێوە نازانن چ شوێنێکی خواردنەکەتان بەرەکەتی تێدایە".** [2]

که سفرەکەیان لادەبرد دەیفەرموو: **"الحمد لله حمداً كثيرًا طيِّبًا مباركًا فيه، الحمد لله الذي كفانا وأرْوَانا، غير مَكْفِيٍّ، ولا مَكْفُورٍ، ولا مُوَدَّعٍ، ولا مُسْتَغْنًى عنه ربَّنا، اللهمَّ إنك أطْعَمْتَ وأسْقيتَ وأغْنيتَ وأقْنَيتَ وهَدَيْتَ وأحْييتَ، اللهمَّ فلك الحمدُ على ما أعطيتَ"**

واتە: **"زۆر سوپاس بۆ خودا، سوپاسێکی بۆنداری پیرۆز، سوپاس بۆ ئەو خودایەی تێر و تێراوی کردین، بە شێوازێك بەس نەبێت، کفری نیعمەت نەبێت، دەست لێبەردان نەبێت، دەستبەرداری نەبێت، خودایە تۆ خواردنت پێداین، تێراوت کردین، دەوڵەمەندت کردین، ڕازیت کردین، ڕێنومابیت کردین، بەزیندوو ڕاتگرتین، خودایە سوپاس هەر بۆ تۆیە لەسەر ئەوەی بە نیعمەت بەخشی".** [3]

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٣٣٤٠. صحيح مسلم: ١٩٤.

٢- مسند أحمد، رقم الحديث: ١٢٨١٥، ١٤٠٨٩. جامع الترمذي: ١٨٠٣.

٣- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٤٥٨، ٥٤٥٩ .





دوای نـــانخواردنیش هەمیشـــە دەم و ددانـــی دەشوشـــت، کـــە ماستاوی بخواردایەتـەوە دەمـی دەشـۆریی و دەیفـەرموو: **"چەوریی هەیە".** [1]

کـە نـانی ئێـوارەی بخواردایـە لـەو ئـاوی ترێیـەی بـەیانی بـۆی دروستکرابوو دەیخواردەوە بەسەریدا، هەروەکو لەنانی بەیانیشدا لـەو ئاوی ترێیەی دەخواردەوە کە ئێواران بۆی دروست دەکرا. [2]

کە یەکێك لە ژنەکانی نانی لەگەڵدا بخواردایە خۆشنوودی دەکرد، هەر خۆیەتی کـە فەرموویـەتی: **"تەنانـەت ئـەو پـارووەش دەیکـەیت بەدەمی ژنەکەتەوە چاکەیە."** [3]

نموونەیەکی تر لەوانە، ئەوەی عائیشە -ڕەزای خـوای لـێ بێـت- هەواڵی پێداوە، کە وتوویەتی: پێغەمبـەر ﷺ بـانگی دەکـردم بۆنـان خـواردن لەگـەڵی لـە کاتێکـدا کـە مـن لـە خـولی مانگانـەدا بـووم، ئێسقانێکی پڕ بە وڵمە گۆشتی هەڵدەگرت لە گەڵمدا دەیکرد بـە دوو بەشـەوە، لـێم دەخـوارد دامـدەنا، ئـەویش لێـی دەخـوارد، پاشـان شـەربەتیان دەهێنـا، دابەشـی دەکـرد لەگەڵمدا پـێش ئـەوەی لێـی بخواتەوە، من لێم دەخواردەوە پاشان دام دەنا ئـەو هـەڵی دەگـرت و

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٢١١، ٥٦٠٩. صحيح مسلم: ٣٥٨.

٢- صحيح مسلم، رقم الحديث: ١٩٩٩، ٢٠٠٤، ٢٠٠٥.

٣- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٢٧٤٢. صحيح مسلم: ١٦٢٨.





لێی دەخواردەوە و دەمی لەسەر ئەو شوێنە دادەنا لە جامەکە کە من دەمم لەسەری دانابوو.[1]

ئای خودایە، ئاخۆ چەند پەیامی بۆندار بەدڵی ئەو هاوسەرە خۆشەویستە گەیشتبێت لە هاوسەرە خۆشەویستەکەیەوە، بەم شێوە پڕ لە ئەوین و پرشنگدارە، هەروەها چۆن ئەو سەر سفرە و خواردنە دەبوو بە خۆراکێك بۆ خۆشەویستی هەروەکو چۆن خۆراکێ بوو بۆ جەستە.



١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٣٠٠.



# نوێژی خەوتنان



پێغەمبەری خوا ﷺ هەتا بانگی خەوتنان لەماڵی خۆی دەمایەوە، پەلەی نەدەکرد لە ئەنجامدانی ئەو نوێژەدا، بەڵکو چاوەڕوانی دەکرد، بیبیستایە کۆبوونەتەوە خێرا دەهاتە دەرەوە، ئەگەر درەنگیش بهاتنایە ئەویش دوا دەکەوت، دواخستنی نوێژەکەی پێ خۆشتر بوو ئەگەر مەترسی شەکەت بوونی خەڵکی نەبوایە.[1]

جارێکیان دوای خستن، عومەر هات بۆ لای بانگی کرد، پێغەمبەری خوا ئەوە ژن و منداڵ نووستن، پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەری تەڕەوە هاتە دەرێ، ئاوی لاتەنیشتی دەسڕی و دەیفەرموو: **"بەڕاستی ئەمە کاتی خۆیەتی، ئەگەر ئومەتم شەکەت نەکردایە فەرمانم پێدەدان لەم کاتەدا نوێژەکانیان ئەنجام بدەن".**[2]

پێغەمبەری خوا ﷺ سوکەڵەترین کەس بوو لە تەواوکردنی نوێژدا، ئەنەس -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێ: نوێژم نەکردوە لە

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٦٠، ٥٦٥، ٥٦٦، ٥٦٩. صحيح مسلم: ٦٣٨، ٦٤٦.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٧٢٣٩. صحيح مسلم: ٦٣٩.



دوای هیچ پێش نوێژێکەوە سوکەڵەتر و تەواوتر بێت لە نوێژی پێغەمبەر ﷺ.[١]

جاروبار کاتێ گوێی لە گریانی منداڵ بوو کە لەگەڵ دایکیدا هاتبوو سورەتە کورتەکانی دەخوێند، نەك دایکی منداڵەکانیش ماندووبن، دەیفەرموو: **"کە من نوێژدادەبەستم و دەمەوێ درێژی بکەمەوە، گوێم لە دەنگی منداڵ دەبێت، نوێژەکە خێرا دەکەم، هەست بە خەمی دایکی دەکەم بۆ منداڵەکەی."**[٢]

کە نوێژی خەوتنان دەکرا ئەگەر شتێکی گرنگ هەبووایە باسی دەکرد بۆ هاوەڵانی.

نموونەیەك لەوانە، کە سڵاوی دایەوە، هەستاو فەرمووی: **"خەڵکینە سەرنجی ئەم شەوەی خۆتان دا، چونکە لە سەرەتای هەر سەد ساڵێکدا هیچ کەسێکی سەر پشتی ئەم زەویە لە ژیاندا نامێنێت".**[٣]

جارێکیشیان نوێژی خەوتنانی دواخست، پاشان نوێژی کرد بە هاوەڵانی، دوای ئەوە گوتاری بۆ دان، فەرمووی: **"ئەوە خەڵك**

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٤٦٩.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٧٠٧-٧١٠. صحيح مسلم: ٤٧٠.

٣- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١١٦، ٥٦٤. صحيح مسلم: ٢٥٣٧.





**نوێژیان کرد و پاشان خەوتن، ئێوەش هەتا لە شوێنی نوێـژەکانتان بن و چاوەڕوانی نوێژبن وەك ئەوەیە لە نوێژدا بن."** [1]

جارێکیان نوێـژی خـەوتنانی دواخسـت تـا نیـوەی شـەو، پاشـان چووەدەرەوە بۆ لایان و پێش نوێژی بۆ کردن، کە نوێژەکەیان تـەواو کرد، بە ئامادەبوانی فەرموو: **"لەسەرخۆبن، مژدەتان لێ بێت، یەکێك لە ناز و نیعمەتەکانی خوا بەسەر ئێوەوە، ئەوەیە کە لەم کاتەدا جگە لـە ئێـوە کەسـێکی تـر نوێـژناکات"**، هاوەڵـەکانی بەدڵخۆشـی ئـەو مژدەیەی پێغەمبەرەوە ﷺ گەڕانەوە بۆ ماڵەوە. [2]

قسەکردنی دوای نوێژەکانی خەوتنانی کەم و کورت بـوون، لەبـەر شەکەتی و پێویسـتی خـەڵك بـۆ خـەو، بۆیـە پێـی نـاخۆش بـوو دوای نوێژی خەوتنان قسە بکات. [3]

کە سـڵاوی دەدایـەوە دەمایـەوە، هـەتا ژنـان بڵاوەیـان دەکـرد و دەڕۆیشتنە ماڵی خۆیان پێش هاتنە دەرەوەی پێغەمبەر ﷺ، جا کە پێغەمبەر ﷺ هەڵدەستا پیاوانیش بە دوایدا هەڵدەستان. [4]

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٨٤٧. صحيح مسلم: ٦٤٠

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٦٧، ٥٧٠، ٢٧٦٠. صحيح مسلم: ٦٣٩، ٦٤١.

٣- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٦٨، ٥٩٩، ٧٧١. صحيح مسلم: ٦٤٧

٤- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٨٤٩، ٨٥٠، ٨٧٠.





# شەوانی پێغەمبەر ﷺ



پاشان دەگەڕایەوە ماڵێ، دوو ڕکات نوێژی سوننەتی خەوتنانی دەکرد، چەند ساتێکیش لەگەڵ هاوسەرەکانیدا دادەنیشت و قسەی لەگەڵدا دەکردن و دڵخۆشی دەدانەوە، شەوگاری لەگەڵ بەسەردەبردن پێش ئەوەی بخەوێت، یان دەچووە لای یەکێك لە هاوەڵانی شەوگاری بەسەردەبرد، هەندێ جار لای پشتیوانان شەوگاری بەسەر دەبرد، لەگەڵ ئەبوبەکر و عومەریشدا، لە ماڵی ئەبوبەکر شەویان بەسەر دەبرد و، باسی کاروباری موسوڵمانیان کرد، کە دەڕۆشتە دەرەوە هەردووکیان چێژیان وەردەگرت لە ڕۆیشتن لەگەڵیدا هەتا خۆیان دەکرد بەمزگەوتدا.[1]

هەندێ جار لەسەر ڕێگا گوێی لە قورئانخوێنێکی دەنگ خۆش دەبوو کە قورئانی دەخوێند، دەوەستا و گوێی لەو خوێندنە خۆشە دەگرت، هەروەکو جارێکیان لە شەودا بەلای ماڵی ئەبو موسای ئەشعەریدا تێپەڕی، وەستا و گوێی بۆ گرت، کە ڕۆژ بووەوە بینی، پێی فەرموو: **"ئەبو موسا خۆزگە چاوت لێدەبوو کە چۆن دوێنێ شەو**

---

١- صحیح البخاري، رقم الحدیث: ٤٥٦٩. صحیح مسلم: ٧٦٣، ٢٠٥٥.



**گـوێم گرتبـوو بـۆ قورئانخوێندنەکـەت، بەڕاسـتی تـۆ یـەکێك لـە جوزەلەکانی ئالی داودت پێ بەخشراوە.**[1]

شەوێکیان چووە مزگەوت، بینی وا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود – ڕەزای خوای لێ بێت– نوێژدەکات و سورەتی (النساء) دەخوێنێت، پێغەمبەر ﷺ وەستا و گوێی شلکرد بۆ قورئانخوێندنەکەی، ئـەنجا بـە ئەبوبـەکری فـەرموو: **"ئەگـەر کەسـێك حـەزدەکات وەك ڕۆژی دابەزینەکەی بە تەڕ و پاراوی قورئان بخوێنێت با بەشێوەی کوڕی ئومو عەبد بیخوێنێتەوە".**[2]

کە دەچووە مزگەوت سڵاوێکی دەکرد، بێداران گوێیان لێ دەبوو، بـەڵام نوسـتوانی وەخەبـەر نـەدەهێنا، چـونکە مزگـەوت هـەژارانی موسوڵمانانی تێدا دەنووست، پاشان نوێژی لە مزگەوتدا دەکرد پـێش ئەوەی بڕواتەماڵەوە.[3]

کە دەچووە ماڵەوە دەیویست بخەوێت جلی سوکی لەبـەردەکرد، دووپارچە جلەکەی هەڵدەواسی، پاشان دەچـووە نـاو پـەردەی جێـی هاوسـەرەکەی، شـوێنی نووسـتنەکەی چـەرمی خـوری کـێش بـوو،

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٠٤٨. صحيح مسلم: ٧٩٣.

٢- مسند أحمد، رقم الحديث: ٣٥، ١٧٥، ٤٣٤٠، ١٨٤٥٧. سنن ابن ماجه: ١٣٨.

٣- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٠٥٥.



هەروەها سەرینی ژێر سەریشی چەرمی خوری کێش بوو، کە دەیخستە ژێر سەری خۆی و خێزانی.[1]

کە دەیویست بخەوێت، سیواکەکەی لای سەری دادەنا، بۆ ئەوەی کە هەستا سیواکی پێ بکات، هیچ کاتێکیش شەو و ڕۆژ بنوستایە بەبێ سیواککردن هەڵنەدەستا.[2]

کە سیواکی دەکرد پاشان دەیدایە دەست عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێت- بۆی بشۆرێت، ئەو لە پێشەوە سیواکی پێدەکرد بۆ ئەوەی لەو پیرۆزیەی بەربکەوێت، ئەنجا دەیشۆری و بۆی دەگێڕایەوە.[3]

سیواکەکەی هەمیشە پاك و تەمیز بوو، لە نزیك خۆیەوە بوو، بە بەردەوامی دەمە پاك و خاوێنەکەی پێ سیواك دەکرد، تەنانەت مەترسی کەوتنی دانەکانی لێ نیشت ئەوەندە سیواکی کردبوو.[4]

هەروەکو دەمی ئەم بۆنخۆشکردنەی پێویست بێت چونکە فریشتەکانی پێ دەدوێنێت، هەروەها دووردەکەوتەوە لە پاقلەمەنی و سەوزەواتی بۆندار و دەیفەرموو: "ئەوانە حەرام نین، بەڵام شەرم

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ١٤٧٩، ٢٠٨٢.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٢٤٥. صحيح مسلم: ٢٥٥.

٣- سنن أبي داود، رقم الحديث: ٥٢. سنن البيهقي: ٣٩/١

٤- مسند أحمد، رقم الحديث: ١٦٠٠٧، ٢٢٢٦٩. سنن ابن ماجه: ٢٨٩.



دەکەم لە فریشتەکانی خودا، من لەگەڵ کەسانێ ڕازونیاز دەکەم کە تۆ ئەوە ناکەیت".[1]

لەبەر ئەوە هەمیشە سیواکی هەڵدەگرت، کە هەڵدەستا بەکاری دەهێنا، کە دەنووست لای سەری دایدەنا.

کە دەچووە ناو جێگەکەی دەیفەرموو: "الحمد لله الذي أطْعَمنا وسقانا، وكفانا وآوانا، فكم ممّن لا كافي له مؤْوِي، الحمد لله الذي مَنَّ عَلَيَّ فأفْضَل، والذي أعطاني فأجْزَل، الحمد لله على كل حال، اللهمَّ ربَّ كلِّ شيء، ومالكَ كلِّ شيء، لك كلُّ شيء، أعوذ بك من النار"

واتە: "سوپاس بۆ ئەو خودایەی تێر و تێراوی کردین، بەشی داین و جێگای کردینەوە، ئای چ کەسانێك هەبن کە نەبەشیان دەکات و نەشوێنیان هەیە، سوپاس بۆ ئەو خودایەی منەتی بەسەردا کرد و باشتری کرد، ئەو خودایەی بە تەواوی پێی بەخشیم، سوپاس بۆ خودا لەسەر هەموو دۆخێك، خودای هەموو شتێك خاوەنی هەموو شتێك، هەموو شتێك هەر بۆ بۆتۆیە، پەنا دەگرم بە تۆ لە ئاگر.[2]

هەردوو لەپی دەستی پیرۆزی دەنووساند بەیەکەوە و فوی پێدادەکردن و ئەم سورەتانەی دەخوێند: (الاخلاص)، هەروەها

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٨٥٥. صحيح مسلم: ٥٦٤.

٢- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٧١٥.



(الفلـق) ، هــەروەها (النــاس)، پاشــان دەســتی دەهێنــا بەســەر ڕووخساریدا و سێ جاریش دەیهێنا بە جەستەیدا.[1]

کە پاڵبکەوتایە لەسەر لای ڕاست دەنووست، دەستی لە ژێر ڕوومەتی دادەنا و دەیفەرموو:"اللهمَّ باسمك أحيا، وباسمك أموت، اللهمَّ قِني عذابك يومَ تبعثُ عبادَك".

واتە: "خودایە بەناوی تۆ دەژیم، بەناوی تۆ دەمرم، خودایە ڕۆژی زیندووبوونەوە لە ئەشکەنجە بم پارێزە".[2]

هەندێ ویرد هەبوو لە کاتی نوستندا دەیوتنەوە، بۆ نموونە:

" اللهمَّ ربَّ السماوات، وربَّ الأرض، وربَّ العرش العظيم، ربَّنا وربَّ كلِّ شيء، فالقَ الحبِّ والنَّوى، ومنزِلَ التوراةِ والإنجيل والفرقان، أعوذ بك من شرِّ كل ذي شرٍّ أنت آخذٌ بناصيته، اللهمَّ أنت الأولُ، فليس قبلك شيءٌ، وأنت الآخرُ، فليس بعدك شيءٌ، وأنت الظاهرُ، فليس فوقك شيءٌ، وأنت الباطنُ، فليس دونك شيءٌ، اقضِ عنَّا الدينَ، وأغْنِنا من الفقر".

واتە: "خودایە، پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و عەرشی گەورە، پەروەردگاری ئێمە و هەموو شتێك، لەتکەری دەنك و دەنکۆڵە، دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و قورئان، پەنا دەگرم بە تۆ

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٠١٧. صحيح مسلم: ٢١٩٢

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦٣١٢، ٦٣١٥، ٦٣٢٤، ٧٣٩٤. صحيح مسلم: ٢٧١١.



**لە خراپەی هەرشتێك، كاربەدەست تۆیە، خودایە تەنها تۆ یەكەمینی، هیچ شتێك پێش تۆ نەبووە، تۆش دوایین دەبیت، لە دوای تۆ هیچی تر نیە، تۆ زاڵی، هیچ شتێك لەسەرتەوە نیە، تۆ ناخیت هیچ شتێك بێ تۆ نیە، خودایە قەرزەكانمان بۆ لابدە، لەم هەژاریەدا دەوڵەمەندمان بكە".[1]**

**"بسم الله وضعتُ جنبي، اللهمَّ اغفرْ لي ذنبي، واخْسَأْ شيطاني، وفُكَّ رِهاني، وثَقِّل ميزاني، واجعلني في النَّديِّ الأعلى".**

واتە: "بەناوی خوداوە پاڵم دایەوە، خودایە لە گوناهم خۆشبە، شەیتانەكەم شەرمەزاركە، گەردنم ئازاد بكە، تەرازووم قورس بكە، بم خەرە شوێنە هەرە بەرزەكەی بەهەشتەوە".[2]

**"اللهمَّ أسلمتُ نفسي إليكَ، ووجَّهتُ وجهي إليكَ، وفوَّضتُ أمري إليكَ، وألجأتُ ظهري إليكَ، رغبةً ورهبةً إليكَ، لامَلْجَأَ ولا مَنْجَا منكَ إلاَّ إليكَ، آمنتُ بكتابك الذي أنزلتَ، وبنبيكَ الذي أرسلتَ"**

**واتە: "خودایە گیانی خۆم دایە دەستی تۆ، ڕووم لە تۆ كرد، كاروبارم خستە دەستت، پشتم دا بە تۆوە، خەمم بۆ لای تۆیە، پەناگریی و قوتاربوون لە دەست تۆ**

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٧١٣.

٢- سنن أبي داود، رقم الحديث: ٥٠٥٤.



**نیــە، بــاوەڕم هێنــا بــەو پــەڕاوەی ناردوتــە خــوارەوە، بــەو پێغەمبەرەی ناردت".**[1]

هەندێ جار چەند سورەتێکی لە قورئان دەخوێندەوە، جاروبار (السجدة)ی دەخوێند و هەندێ جاریش ﴿هـل أتـى علـى الانسـان﴾ و، هەندێ جاریش سورەتی (الزمر) و (الاسراء)ی دەخوێند.[2]

پاشان دەکەوتە هۆگری و قسەوباس لەگەڵ خێزانەکانی بۆ چەند ساتێك، سەرنج بدە لەو خەڵوەتەی ڕوویدەدا لەنێوان مێردێکی خۆشەویست و ژنە هاوسەرێکی خۆشەویستی چاوەڕوان لە هێمنایەتی شەو و ئارامی شارە جوانەکەی مەدینەدا، ئەوە بەخششێکی ویژدانیە بەسەر دڵ و دەروونـدا دەڕژێـت، بـە چـەندین جـۆری خـۆش و پرشـنگداریەوە، ئەمـە قوڵایـەتی ویـژدانی چەسـپاوی نـاخ و دڵ دەبەخشێت بەو پەیوەندیە.

پاشان ئەو ڕازە جوانە، ئەگەر پێویستی هەبوایە حەزی ژن و مێردایەتی دابین دەکرد، کە لە کاری ژن و مێردایەتی تەواو دەبوون ژنەکەی پەڕۆیەکی دەدایە خۆی پێ دەسڕی و ئەویش خۆی پێ دەسڕی.

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦٣١٥.

٢- مسند أحمد، رقم الحديث: ١٤٦٥٩، ٢٤٣٨٨، ٢٥٥٥٦. جامع الترمذي: ٢٨٩٢، ٣٤٠٥، ٣٤٠٦.



هەندێ جار لەکاتی سوڕی مانگانەدا دەکەوتە لای یەکێك لە ژنەکانی، بێ بەشی نەدەکرد لە خۆشیی و چێژی هاوسەرێتی، لەکاتی سوڕەکەیدا دەچووە لای خێزانی، پێی دەوت کە خۆی داپۆشێت، هەموو جۆرە کارێکی ژن و مێردایەتی لەگەڵدا دەکرد جگە لە جووت بوون.[1]

ئەمەش نیشاندانی ئارەزووە بۆ ژن، ئەم جۆرە هەڵوێستە سروشتیە ناهێڵێ پەیوەندیی پرشنگداری هاوسەرێتی دابڕێت.

نموونەیەك لەوانە، فەرموودەکەی ئومو سەلەمەیە –ڕەزای خوای لێ بێت– کە دەڵێ:

"لە ناو جێگەدا لەگەڵ پێغەمبەردا بووم، لەکاتی سوڕی مانگانەدا بووم، لەژێر پەردە پۆشەکە دەرچووم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەوە چیە زەیستانیت؟"** وتم: هەست دەکەم وەك ژنان لە سوڕی مانگانەدام، فەرمووی: **"ئەوە فەرمانی خودایە لەسەر هەموو کچانی ئادەمی نووسیوە"**، دەڵێ: دەرچووم خۆم پاککردەوە و پاشان گەڕامەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: **"وەرە ناو جێگەکە لەگەڵم"**. ئومو سەلەمە دەڵێ: لەگەڵی چوومە ناو پەردەکەیەوە.[2]

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٣٠٢. صحيح مسلم: ٢٩٣.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٢٩٨، ٣٢٣. صحيح مسلم: ٢٩٦.



پـێش نووسـتن لەشـگرانی خـۆی دەردەکـرد، هەنـدێ جـاریش دەستنوێژی دەگرت و دەنووست و خۆشۆردنی دوادەخست بۆ کاتی لەخەوهەستانی.[1]

هەندێ جار لەگەڵ هاوسەریدا بەیەك تەشت ئاو خۆیاندەشۆری و، دەستیان تێکەڵ دەبوو، ژنەکە دەیوت، دەستت لابە، پێغەمبەریش دەیفەرموو: "**تۆ دەستت لابـە**"[2]، ئەمـەش بەشـێك بـوو لـە خۆشـی و چێژی نێوان ئەو ژن و مێردە.

پاشان دەنووست، لە شیرینی خەودا دەنگی بـەرزی هەناسـەکانی دەبیسترا، کە لە ناو جێگەدا گنلگـێ بدایـە دەیفـەرموو:"**لا إلـه إلا الله الواحدُ القهارُ، ربُّ السموات والأرض وما بينهما العزيزُ الغفّار**". واتـە: "**جگـە لـە خـوای تـاکو و تـەنها و بەزێنـەر، تـەنها پـەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و نێوانیان هیچ کەسێکی تر نیـە، ئـەو خودایـە بەرز و لێبوردەیـە**".[3] کـە گێنگلـی دەدا لـە شـەودا سـیواکی دەکـرد، پاشان دەگەڕایەوە سەرخەوەکەی هەتا نیوەی شەو.[4]

پێدەچێ ئەوە درێژترین کاتی خەوی پێغەمبەر بووبێت ﷺ.

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٣٠٧.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٢٦١. صحيح مسلم: ٣٢١.

٣- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦٩٨. صحيح مسلم: ٧٦٣.

٤- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٢٤٥. صحيح مسلم: ٢٥٥، ٢٥٦، ٧٤٦.





# هەستانی شەو



که نیوەشەو دادەهات هەڵدەستا، خەوی لە چاوی دەتۆراند، سیواکەکەی دەردەهێنا و، دەمی پیرۆز و پاکی پێ سیواك دەکرد، پاشان چاوی بۆ ئاسمان بەرزدەکردەوە، بە ئەندێشەکی قوڵ بیری لە هێمنی شەوگار و گەورەیی خودا دەکردەوە لە دروستکردنی بەدی هێنراوەکاندا و ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: (بەڕاستی لە بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازی نێوان شەو و ڕۆژدا چەندین بەڵگەهەن بۆ مرۆڤە ژیرەکان، ئەوانەی یادی خوا دەکەن لە هەستان و دانیشتن و پاڵکەوتنیاندا بیردەکەنەوە لە دروستکردنی ئاسمانەکان و دەڵێن: پەروەردگارمان بەڕاستی تۆ بێ هۆ ئەم زەویەت دروست نەکردوە، پاك و بێگەردی بۆ تۆ، لە ئەشکەنجەی ئاگر بمانپارێزە)، هەتا کۆتایی دە ئایەتەکەی سورەتی (آل عمران) :

﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ{١٩١} رَبَّنَا إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ




أنصَارٍ{١٩٢} رَّبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِياً يُنَادِي لِلإِيمَانِ أَنْ آمِنُواْ بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الأبْرَارِ{١٩٣} رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَى رُسُلِكَ وَلاَ تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لاَ تُخْلِفُ الْمِيعَادَ{١٩٤} فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ فَالَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخْرِجُواْ مِن دِيَارِهِمْ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُواْ وَقُتِلُواْ لأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ ثَوَاباً مِّن عِندِ اللّهِ وَاللّهُ عِندَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ{١٩٥} لاَ يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ الَّذِينَ كَفَرُواْ فِي الْبِلاَدِ{١٩٦} مَتَاعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهَادُ{١٩٧} لَكِنِ الَّذِينَ اتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا نُزُلاً مِّنْ عِندِ اللّهِ وَمَا عِندَ اللّهِ خَيْرٌ لِّلأَبْرَارِ{١٩٨} وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَمَن يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَاشِعِينَ لِلّهِ لاَ يَشْتَرُونَ بِآيَاتِ اللّهِ ثَمَناً قَلِيلاً أُوْلَـئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِنَّ اللّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ{١٩٩} يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ ١٩٠–٢٠٠.

پاشان چوو بۆ لای (کونە) هەڵواسراوەکە و گرێیەکەی دەمی کردەوە، ئاوی دەکردە دەفرێکی بەردەستی پاشان دەستنوێژی دەشۆشت و، جلوبەرگەکەی لەبەردەکرد و، پارچە پەڕۆیەی لادەبرد کە خۆی پێدا دەپۆشی، ئەنجا شەونوێژی دەکرد.[١]

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١٨٣، ٩٩٢. صحيح مسلم: ٧٦٣.

هەندێ جار پێش ئەوەی شەونوێژەکەی دەست پێ بکات، زمانی بە یادی خودا و تەسبیحات و بەگەورە زانینی خودا پاراو دەکرد، هەروەکو ئەوە بۆ خۆئامادەکردن بێت بۆ شەونوێژ عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێت: کە شەو دادەهات پێغەمبەر ﷺ دە جار دەیفەرموو (الله اکبر) و، دە جار دەیفەرموو (الحمد لله) و، دەجاریش دەیفەرموو: **"سبحان الله و بحمده"**، دە جاریش دەیفەرموو: **"سبحان الملك القدوس"** و، دە جاریش (استغفر الله) و، دە جاریش (لااله الا الله)، پاشان دەیفەرموو: **"اللهمَّ إنِّي أعوذ بك من ضيق الدنيا، وضيق يوم القيامة"** واتە: **"خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لەبەر تەسکی دونیا و بەرتەنگی قیامەت"** ئەمەشی دە جار دەوتەوە، ئەنجا نوێژی دادەبەست.[1]

بە دوو ڕکاتی سووك نوێژەکەی دەستپێدەکرد، ئەگەر نوێژی بەخەڵك بکردایە بە سوکترین شێوە پێی دەکردن، خۆ ئەگەر بە تەنها نوێژی بکردایە ئەوا درێژترین نوێژی دەکرد، شەو نوێژەکانی درێژترین بوون لە دەست پێ کران و قورئانخوێندن و دوعاکردندا، ئەمەش بۆ بەرقەرارکردنی فەرموودەی خواوەند: (وشە بە وشە قورئان بخوێنەرەوە) المزمل:٢.[2]

---

١- مسند أحمد، رقم الحديث: ٢٥١٠٢. سنن أبي داود: ٧٦٦، ٥٠٨٥.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٧٠١. صحيح مسلم: ٤٦٩، ٧٦٥.



ئەو کەسەی سەرنجی بدایە لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ لەکاتی شەو نوێژدا، هەستی دەکرد کە ئەو شەونوێژە هەموو گیانی پێغەمبەری داگیردەکرد ﷺ، ئەو نوێژەی هەموو هەست و نەست و ڕازێکی ناخی پێغەمبەری کۆدەکردەوە، هەروەك گیانی بەرەو ئاسمان بەرزبووبێتەوە و، پەردە نوورینە خوداییەکان دایانپۆشیبێت، چونکە بەبەرجەستەیی دەیڕوانیە عەرشی خودا و، بە تەنها ڕازی لەگەڵدا دەکرد، بە باشترین شێواز سوپاسی پەروەردگاری دەکرد و، بەمەزنترین شێوازیش ستایشی دەکرد، نزاکردنی بە کورت و پڕ ماناترین دوعا سەیرنیە، چونکە ئەو زاتە بوو کە شەوڕەویی پێکرا و، حەوت ئاسمانەکەی بەڕوودا والآکرا و، بەرزکرایەوە تا ئەو ئاستەی گوێی لە خزمەتی نووکی قەڵەمەکان بوو.[1]

خوداناسترین کەس بۆ خودای خۆی، تێر و تەواوەترین باوەڕی هەبوو، ڕاستگۆترین متمانەی هەبوو، ڕاستی وت و چاکەی کرد کە فەرمووی: **"لە خواترسترینتان و زاناترینتان بە خواوەند، منم".**[2]

کە نوێژی دادەبەست وەك کەسێکی خودابەگەورەزان دایدەمەزراند، کەسێکی خۆشەویست و ئاشوفتە بۆ خودا، نوێژدابەستنەکەی بە تەواوی مانا پڕبوو لە گەورەزانی و سوپاس و وەسف و سەنای خودا.

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث:٣٤٩، ٣٣٤٢. صحيح مسلم: ١٦٣.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٢٠.



یەکێك لە و دوعایانەی سەرەتای شەو نوێژەکەی پێدەکردەوە:

" اللهمَّ ربَّ جبرائيل ، وميكائيـل ، وإسـرافيل ، فـاطرَ السـماوات والأرض ، عالمَ الغيب والشهادة ، أنت تحكمُ بين عبادك فيما كانوا فيه يختلفون ، اهدني لما اختُلف فيه من الحق بإذنك ، إنك تهدي مَن تشاء إلى صراط مستقيم".

واتە: "خودایە، پەروەدگاری جوبرەئیل و میکائیل و ئیسرافیل بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، ئاگا بـە پـەنهان و بینـراو، خـۆت فەرمانڕەوایی دەکەیت لە نێوان بەندەکاندا لەسەر ئەوشتانەی کۆکنین تیایدا، ڕێنوینیم بکە لەسەر ئەو شتەی جیاوازم لەسەری تۆ ڕێنمایی هەرکەسێك دەکەیت کە خۆت بتەوێت بەرەو ڕێگای ڕاست".[1]

نموونەیەکی تر لەو دوعایانە:

" اللهمَّ لك الحمدُ ، أنت نُورُ السموات والأرض ومَـن فـيهنَّ ، ولـك الحمدُ ، أنت قَيِّمُ السموات والأرض ومَن فيهنَّ ، ولك الحمـدُ أنـت مَلِـكُ السوات و الأرض ومَن فيهنَّ، ولك الحمدُ، لك مُلْك السوات والأرض ومَن فيهنَّ، ولك الحمدُ ، أنت الحقُّ ، ووعدك حقٌّ، ولقاؤُك حقٌّ، وقولُك حقٌّ ، والجنة حقٌّ ، والنار حقٌّ ، والنبيون حقٌّ ، ومحمـدﷺ حـقٌّ، والسـاعة حقٌّ، اللهمَّ لك أسلمتُ ، وعليك آمنتُ ، وبك توكلتُ ، وإليك أنبتُ ، وبك خاصمتُ ، وإليك حاكمتُ ، فاغفرْ لي ما قدَّمتُ وما أخَّرتُ ، وما أسررتُ

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٧٧٠.



وما أعلنتُ، أنت إلهي، لاإله غيرك، أنت المقدِّم وأنت المؤخِّر ، لا إله إلا أنت، ولا حولَ ولا قوَّةَ إلا بالله".

واتە: "خودایە سوپاس هەر بۆ تۆیە، تۆ ڕووناکی ئاسمانەکان و زەویت لەگەڵ ئەوەی لە ناویدان، سوپاس بۆ تۆ، شای ئاسمانەکان و زەمین لەگەڵ ئەوانەی لەناویدان سوپاس بۆ تۆ، هەر خۆت ڕاستەقینەیت، بەڵێنت ڕاستە، گەیشتن بە تۆ ڕاستە، گوتەت ڕاستە، بەهەشت ڕاستە، ئاگر ڕاستە، پێغەمبەران ڕاستن، محمدیش ﷺ ڕاستە، ڕۆژی دوایی ڕاستە، خودایە خۆم دایە دەست تۆ، باوەڕم بە تۆ هێنا، پشتم بەتۆ بەست، بۆ لای تۆ دادم دەهێنم، لە گوناهی پێش و پاش و نهێنی و ئاشکرام خۆشبە، تۆ پەروەردگاری منی، جگە لە تۆ خودایەکی تر نیە، تۆ پێشخەری، تۆ پاشخەری، جگە لە تۆ خودایەکی تر نیە، بەڕاستی تاکە پەناگەی دەسەڵات و هێز هەر خوایە.[1]

لەو دوعایانە: "وجَّهتُ وجهي للذي فطرَ السماوات والأرض حنيفاً ، وما أنا من المشركين ، إنَّ صلاتي ، ونُسُكي ، ومَحْيَاي ، ومماتي لله ربِّ العالمين، لا شريكَ له ، وبذلكَ أمرتُ وأنا من المسلمين ، اللهمَّ أنت الملِكُ لا إله إلا أنت؛ أنت ربِّي ، وأنا عبدُك ، ظلمتُ نفسي ، واعترفتُ بذنبي ، فاغفرْ لي ذنوبي جميعاً ، إنه لا يغفرُ الذنوبَ إلاَّ أنت ، واهدني

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١١٢٠، ٧٤٩٩. صحيح مسلم: ٧٦٩.





لأحسن الأخلاق، لا يهدي لأحسنها إلاَّ أنت ، واصرفْ عنِّي سيِّئها لا يصرفُ عنِّي سيِّئها إلاَّ أنت ، لبيك وسعديك، والخيرُ كلُّه في يديك ، والشرُّ ليس إليك ، أنا بك وإليك ، تباركتَ وتعاليتَ ، أستغفرك وأتوبُ إليك".

واتە: " وەك خواپەرستێك ڕووم كردە ڕووگەی ئەو زاتەی ئاسمانەكان و زەمینی دروست كرد، من موشریك نیم، نوێژم، خواپەرستیم، ژیانم، مردنم، بۆ پەروەردگاری جیهانیانە، بێ هاوتایە، بەوە فەرمانم پێ كراوە، من یەكێكم لە موسوڵمانان، خودایە تەنها تۆ پاشایت، جگە لە تۆ خودایەكی تر نیە، تۆ پەروەردگاری منی، منیش بەندەی تۆم، ستەمم لە خۆم كرد، دان بە گوناهدا دەنێم، لە هەموو گوناهەكانم خۆشبە، بەڕاستی كەسێك نیە جگە لە تۆ لە گوناهەكان خۆشبێت، ڕێنوماییم بكە بۆ باشترین ڕەوشت، كەسێك جگە لە تۆ ئەو ڕێنومایییە ناكات، ڕەوشتە خراپەكانم لێ لادە، كەسێك جگە لە تۆ لام نادات لە خراپە، بەڵێ بۆ تۆیە خۆشنوودی. هەموو چاكەیەك بە دەست تۆیە، هیچ خراپەیەك هی تۆ نیە، من بۆ تۆم و بۆ لای تۆ دێم، هەمیشە پیرۆز و باڵا بیت، داوای لێبووردنت لێدەكەم و بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە ".[1]

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٧٧١.





پاشان کە قورئانی دەخوێند، بە شێوازێکی لەسەرخۆ و وشە بەوشە دەیخوێند، لەسەر ئایەتێکی بەزەییدا نەدەگوزەرا ئەگەر دوعای نەکردایە بەسەر ئایەتی ئەشکەنجە و خۆپەناداندا نەدەگوزەرا پەنای نەبردایە بۆ خودا، بەلای ئایەتی تەسبیحدا نەدەچوو ئەگەر تەسبیحاتی نەکردایە.[١]

کە شەو هەڵدەستا درێژەی پێدەدا، ئیبنو مەسعود -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێت: شەوێکیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ هەستام بۆ شەونوێژ ئەوەندە وەستا شتی خراپم بە دڵداهات، پێی وترا: جا چی خراپ بە دڵتدا هات؟ وتی: خەریك بوو دانیشم و واز لە پێغەمبەر ﷺ بهێنم.[٢]

هەندێ جار قورئان خوێندنەکەی درێژدەکردەوە و ڕکاتەکانی کورت دەکردەوە، هەندێ جاریش قورئانی کەمی دەخوێندەوە و ڕکاتی زۆری دەکرد، هیچ کاتێك شەونوێژەکانی لە سیانزە ڕکات زیاتر نەبوون.[٣] ماوەی کڕنووشەکانی درێژدەکردەوە بە ئەندازەی وەستانی بۆ خوێندنی قورئان لە نوێژدا.[٤]

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٧٧٢.

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١١٣٥. صحيح مسلم: ٧٧٣.

٣- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١١٤٧، ١١٧٠، ٢٥٦٩. صحيح مسلم: ٧٣٧، ٧٣٨.

٤- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٧٧٢.



له کڕنووشه‌کانیدا ده‌یفه‌رموو: "اللهمَّ لك ركعتُ ، وبك آمنتُ ، ولك أسلمتُ، وعليك توكلتُ، أنت ربي، خَشَعَ لك سمعي وبصري ودمي ولحمي وعظمي وعصبي لله ربِّ العالمين، سبحان ذي الجبروت والكبرياء والعظمة".

واته: "خودایه بۆ تۆ کڕنوشم برد، به‌تۆ باوه‌ڕم هێنا، خۆم دایه ده‌ست تۆ، پشتم به تۆ به‌ست، تۆ په‌روه‌ردگاری منیت، بیستنم و بینینم و خوێنم و گۆشتم و ئێسقانم و ده‌ماره‌کانم بۆ په‌روه‌ردگاری جیهانیانه، پاك و بێگه‌ردی بۆ خاوه‌ن زه‌بر و پایه‌داری و گه‌وره‌یی".[1]

له دوا ڕۆژه‌کانی ژیانیدا له‌کاتی کڕنووش و سوژده‌دا به زۆریی ئه‌م دوعایه‌ی ده‌خوێند: "سبحانك اللهمَّ ربنا وبحمدك، اللهمَّ اغفرْ لي".

واته: "پاك و بێگه‌ردی بۆ تۆیه په‌روه‌ردگار، سوپاس هه‌ر بۆ تۆیه، خودایه لێم خۆشبه".

عائیشه –ڕه‌زای خوای لێ بێت– پرسیاری ئه‌وه‌ی لێ کرد؟ فه‌رمووی: "په‌روه‌ردگارم هه‌واڵی دامێ که نیشانه‌یه‌ك ده‌بینم له ئومه‌ته‌که‌مدا، که بینیم ئه‌م وشانه‌م زۆر ده‌وته‌وه: "پاك و بێگه‌ردی بۆ خودا، سوپاس بۆ ئه‌و، داوای لێ خۆشبوون ده‌که‌م، هه‌ر بۆ لای ئه‌و ده‌گه‌ڕێمه‌وه، ئه‌وه بوو بینیم: ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ* وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجاً* فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٧٧١.



كَانَ تَوَّاباً) النصر:١-٣، واتە: (کاتێ کە یارمەتیی خوایی هات و مەککە گیراو، خەڵکی جزیرەی عەرەبت دی پۆل پۆل دێنە ڕیزی ئایینی خواوە، سوبحانەڵڵا بکە بۆ خوای خۆت و لە گەردی هەموو ناتەواییەکی بە خاوێن ڕابگرەو سەناو ستایشی بکەو داوای لێخۆشبوونی لێ بکە. بەڕاستی ئەو تۆبە وەرگرە لە هەرکەسێ داوای لێخۆشبوونی لێ بکا.)

ئەوا ئاگادارییەك بوو بۆ نزیکبوونەوەی وەفاتی گەیشتنی بە خودای گەورە.[١]

بە ئەندازەی کڕنوشەکانی سوژدەکانی درێژدەکردەوە بە هەموو شێوازێك لە خودای خۆی دەپاڕایەوە، فەرموویەتی: "نزیکترین باری نزیکی مرۆڤ لە خوداوە ئەو بارەیە کە تیایدا لە سوژدە دەبێت، کەواتە نزای زۆر بکەن".[٢]

لە سوژدەکانیدا دەیفەرموو: " اللهمَّ لك سجدتُ ، وبك آمنتُ ، ولك أسلمتُ ، وأنت ربي، سجد وجهي للذي خلقه ، وصوَّره فأحسن صُوَره، ، وشقَّ سمعه وبصره ، فتبارك اللهُ أحسنُ الخالقين ؛ اللهم اغفر لي ذنبي كله، دِقَّهُ وجِلَّه، وأوَّله وآخِرَه، وعلانيته وسرَّه، اللهم إنِّي أعوذ برضاكَ من سخَطِكَ ؛ وبمُعافاتكَ من عُقُوبتِكَ ، وأعوذُ بكَ منكَ، لا أُحْصِي ثناءً عليك ، أنتَ كما أثنيتَ على نفسك، سبُّوحٌ قدُّوسٌ، ربُّ

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٨١٧، ٤٩٦٨. صحيح مسلم: ٤٨٤.

٢- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٤٨٢.





الملائكة والرُّوح" واتە: "خودایە سوژدەم بۆ تۆ برد و باوەڕم بە تۆ هێنا، خۆم دایە دەست تۆ، تۆ پەروەردگاری منیت، ڕووم سوژدەی برد بۆ ئەو زاتەی دروستی کرد، وێنەی کێشا و جوانی کرد، بیستن و بینینی لێوە دەرهێنا، گەورەیی بۆ خودایە کە باشترین بەدیهێنەرە، خودایە لە هەموو گوناهەکانم خۆشبە، ورد و درشتی، یەکەمین و دواییینی، ئاشکرا و نهێنیەکانی، خودایە پەنادەگرم بە ڕەزامەندیت لە توڕەییت، بە لێبوردنت لە سزادانت، پەنا دەگرم بە تۆ لە خۆت، ناتوانم وەسفی تەواوی تۆ بکەم، تۆ بەو شێوازەیت کە وەسفی خۆتت کردوە، ئەی پاك و بێگەرد و بێ لەکە، پەروەرگاری فریشتەکان و جبریل).[1]

ئای خوایە، بۆ ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە کە بەم شێوەیە ڕازی نهێنی لەگەڵ پەروەردگاری خۆیدا دەکات یادی دەکات، بەویادە پڕ لە پیرۆز زانین و گەورەیی و بەخودازانین و ملکەچی نواندن بۆی، ئەمە چ ئاسۆیەکی بالآیە کە گیانی ئەم پێغەمبەرەی بۆ بەرز دەبێتەوە و حەزەکانی بۆ بالآ دەبێت، کە ئەو یادە دەکات و بەو شێوازە لە پەروەردگاری دەپاڕێتەوە، وات دەزانی شاخەکان و زەمینیش گوێیان بۆ گرتووە و ئەستێرەکانی ئاسمانیش نیگای دەکەن، ئەم یادە دەڵێنەوە کە بۆی دابەزیوە: (یادی خودای خۆت بکە و بەلآلانەوە لێی بپاڕێرەوە) المزمل: ٨.

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٤٨٣، ٤٨٦، ٤٨٧.





بەبەردەوامی پێغەمبەرەکەت ﷺ شەوگارەکانی دەبڕی لە نێوان خوێندنەوەی پڕ لە سام و نزاو لاڵانەوە و تەسبیحاتی پاکوبێگەردی بۆ خودا هەتا ئەو کاتەی شەشیەکی شەو تەواو دەبوو.

ئەو لەسەر جێگای نووستنەکەی هەڵدەستا، لەکاتێکدا کە لەشی قورسی موشریکەکان بە جێگاکەوە نووسا بوو، کە شەونوێژەکەی تەواودەکرد و، دەیوست نوێژی وەتر بکات خێزانەکەی هەڵدەستاند بۆ ئەوەی وەترەکەی لەگەڵدا بکات.[1] سێ ڕکات نوێژی وەتری دەکرد لە ڕکاتی یەکەمدا (سبح باسم ربك الأعلى)ی دەخوێند لە دووەمیشدا (قل يأيها الكافرون) و، لە سێیەمیشدا (قل أعوذ برب الناس)ی دەخستە سەری.[2]

لە کۆتایی نوێژە وەترەکەیدا دەیفەرموو: **"اللهمَّ أعوذ برضاك من سخطِكَ ، وبمعافاتِكَ من عقوبتك، وأعوذُ بكَ منكَ، لا أُحْصِي ثناءً عليك أنتَ كما أثنيتَ على نفسك"**.

**واتە: "خودایە پەنادەگرم بە ڕەزامەندیت لە توڕەییت، بە لێبوردنت، لە سزادانت، پەنا دەگرم بە تۆ لە خۆت، ناتوانم بەتەواوی**

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥١٢، ٩٩٧. صحيح مسلم: ٥١٢، ٧٤٤.

٢- مسند أحمد، رقم الحديث: ٢٧٢٠، ٢٧٢٥، ١٥٣٥٤-١٥٣٦٢، ٢٥٩٠٦. سنن أبي داود: ١٤٢٣.



وەسفت بکەم، تۆ بەو شێوازەیت کە وەسف و سەنای خۆتت کردوە".[1]

کە لە نوێژی وەتر دەبوەوە، دەیفەرموو: "سبحانَ المَلكِ القدُّوس، سبحانَ المَلكِ القدُّوس، سبحانَ المَلكِ القدُّوس". واتە: "پاکی بۆ پادشای بێگەرد پاکی بۆ پادشای بێگەرد، پاکی بۆ پادشای بێگەرد"، ئەمەی سێیەمی درێژ دەکردەوە و دەنگی تێدا بەرز دەکردەوە.[2]

پێغەمبەرەکەت لە ژوورێکدا نوێژەکانی دەکرد کە هەرچی خۆشی و ناز و نیعمەتی دونیا هەیە لێی دوور بوو، هەندێ جار لەسەر وشکە حەسیرێکی بچووک نوێژی دەکرد، هەندێ جاریش جگە لەجێگەی هاوسەرەکەی شتێکی نەبوو نوێژی لەسەر بکات، کە نوێژی دەکرد، ئەو ژنەشی لەبەردەمیدا ڕادەکشا، لەبەرئەوەی ماڵەکەی فتیلە و چراخانی تێدا نەبوو، کە دەیویست بڕواتە سوژدەوە بە پەنجەکانی ختوکەی قاچی دەدا، ئەویش قاچی لادەبرد لەسەر شوێنی سوژدەکەی، کە هەڵدەستایەوە ژنەکەی قاچی ڕادەکێشایەوە شوێنی خۆی.[3]

---

١- مسند أحمد، رقم الحديث: ٧٥١، ٩٥٧، ١٢٩٥. سنن أبي داود: ١٤٢٧.

٢- مسند أحمد، رقم الحديث: ١٥٣٥٤– ١٥٣٦٢.

٣- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٣٧٩، ٣٨١، ٣٨٢، ١٢٠٩. صحيح مسلم: ٥١٢.

هەندێ جاری کەم دەچوو لە مزگەوت نوێژەکەی دەکرد، وەك ئەوەی لەبەر ڕوودانی شتێك ئەو کارەی کردبێت، وابزانم لەبەر ئەوە بووبێت ترسا بێ لەوەی بە نوێژەکەی ژنەکەی بەخەبەر بهێنێ لەکاتی نوستنیدا، بۆیە دەچووە مزگەوت، عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێ: شەوێکیان هەستم کرد پێغەمبەر ﷺ لە جێگەکەیدا نەماوە، دەستم بۆ خشاند، دەستم بەر بنی پێی کەوت، ڕاست بووبوونەوە لەکاتی سوژدە بردندا بوو، دەیفەرموو: **"اللهمَّ أعوذ برضاك من سخطِكَ ، وبمعافاتِكَ من عقوبتك ، وأعوذُ بكَ منكَ، لا أُحْصِي ثناءً عليك أنتَ كما أثنيتَ على نفسك"**. واتە: **"خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لە توڕەییت، بە لێبوردنت لە سزادانت، پەنا ئەگرم بە تۆ لە خۆت، ناتوانم وەسفت بکەم، تۆ وەك ئەو شێوازەیت کە خۆت وەسفی خۆتت کردووە"**.[1] هەروەها عائیشە وتی: شەوێکیان لێم ون بوو، وام زانی چووە بۆ لای هەندێ لە خێزانەکانی، بەدوایدا گەڕام، پاشان گەڕامەوە، دەبینم ئەو لە کڕنوشدایان سوژدەدا بوو، دەیفەرموو: **"سبحانك وبحمدك، لاإله إلا أنتَ"**.

واتە: **"پاکی و سوپاسگوزاری بۆ تۆیە، خودایەك نیە جگە لە تۆ"**، عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێ: دایك و بابم بەقوربانت بن پێغەمبەری خوا، من لە خەمێکم و تۆش لە خەمێکی تر.[2]

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٤٨٦

٢- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٤٨٥.

# چەند هەنگاوێك لە ئارامی شەودا



هەندێ شەو لەكاتی شەونوێژدا دەچوو بۆ ماڵی فاطمەی كچی و عەلی -ڕەزای خوایان لێ بێت- لە دەرگای دەدان و بانگی لێدەكردن: "**ئەرێ هەڵناسن نوێژ بكەن؟**" عەلی -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێ: وتم پێغەمبەری خوا گیانی ئێمە بەدەستی خودایە، ئەگەر ویستی بەئاگامان دێنێتەوە، كە ئەم قسەیەم وت پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە و هیچ وەڵامی نەدامەوە، پاشان گوێم لێ بوو، دەیكێشا بەسەرڕانی خۆیدا و لەبەر خۆیەوە دەیفەرموو: ﴿وَكَانَ الْإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلاً﴾ الكهف:٥٤، واتە: (ئینسان لە هەموو شت زیاتر دەمەتەقێ و قسەبەزێنە دەكات).[١]

لە كۆتاییەكانی ژیانیدا شەوان دەچوو بۆ بەقیع، نزای بۆ دەكردن، هەر لە سەرەتای ئەوەشەوە عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێت- هەواڵمان پێ دەدات و دەڵێ، ئەو شەوەی كە سەرەی من بوو، پێغەمبەر ﷺ لە لام بوو، هاتەوە و جلەكانی دانا، نەعلەكانی داكەند و لە نزیك قاچییەوە داینان، لایەكی پشتە ماڵەكەی ڕاخست و پاڵ

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١١٢٧، ٧٣٤٧. صحيح مسلم: ٧٧٥.



کەوت، ئەوەندە نەمایەوە، تا گومانی برد کە من نووستووم، وردە وردە جلەکانی برد، بەهێواشی دوورکەوتەوە، منیش سەر و پێچەکەم لەسەرکرد و سەرپۆشم دابەسەرمدا و خۆم بالاپۆشکرد و بەدوایدا ڕۆیشتم.

هەتا گەیشتە بەقیع، زۆر بە پێوە وەستا، پاشان سێ جار دەستی بەرز کردەوە پاشان لای داو منیش لامدا، پەلەی کرد منیش پەلەم کرد بەدوایدا، کەوتە ڕاکردن و منیش بەدوایدا، ئەنجا گەڕایەوە ماڵەوە، منیش گەڕامەوە بەڵام پێشی کەوتم و چوومە ژوورەوە.

کەمێك بوو پاڵکەوتبووم لە جێگەکەدا، هاتە ژوورەوە و فەرمووی: "ئەرێ چیە عائیشە جێگاکەت بەجێ هێشتووە؟ "دەڵێ: وتم: هیچ نیە، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: **"یان پێم دەڵێیت، یان خواوەندی ورد و شارەزا ئاگادارم دەکاتەوە"**، دەڵێ: وتم: پێغەمبەری خوا ﷺدایك و باوكم بەقوربانت بن..... هەواڵەکەم پێدا، فەرمووی: **"کەواتە ئەو تارمایییەی کە لە بەردەممەوە ڕۆیشت تۆ بوویت؟"** وتم: بەڵێ، ئەمجا مستەکۆڵەکەیەکی دا لەسەر سنگم ئازارم پێ گەیشت، پاشان فەرمووی: **"پێت وابوو کە خودا و پیغەمبەرەکەی ستەمت لێ بکەن"**، وتی: خەڵك هەرچەندە شت بە پەنامەکی بکەن خودا پێی دەزانێت، بەڵێ. فەرمووی: **"جوبرەئیل هاتە لام کە تۆ سەیرت دەکرد، بانگی کردم و خۆی لە تۆ حەشاردا، کە وەڵامم دایەوە خۆی لە تۆ حەشاردا، کە تۆ جلەکانت لابرد نەهاتە ژوورەوە،**



**وامزانی نووستویت، پـێم نـاخۆش بـوو بێدارت بکەمـەوە، ترسیشـم هەبوو هەست بە تەنهایی بکەیت"، فەرمووی: "جبریل پێی فەرمووم، پەروەردگارت فەرمانت پێدەکات سەردانی گۆڕستانی بەقیع بکەیت و داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەیت".**

عائیشە –ڕەزای خوای لێ بێت– دەڵێ: وتم پێغەمبەری خـوا مـن چیان پێ بڵێم؟ فەرمووی: **"بڵێ (سڵاوتان لێبێت خەڵکی گۆڕستان لە ئیمانداران و موسوڵمانان، خودا ڕەحم بکات بە پێشین و پاشینمان و ئێمەش خودا یاربێت پێتان دەگەینەوە".**

پاش ئەوە هەموو کۆتایی شەوێك دەچوو بۆ بەقیع و دەیفـەرموو: **"سڵاوتان لێ بێتماڵی گەلی ئیمانداران، ئـەوەی بـەڵێنتان پێـدەدرا پێی گەیشتن، دوا ڕۆژیش دواخراوین، خوا یاربێت ئێمـەش بـە ئێـوە دەگەینەوە، خودایە لە خەڵکی (بقیع الغرقد) خۆشبیت".**[1]

ئای خودایە بۆ حاڵی ئەو پێغەمبەرە ﷺ کە لـە ئـارامی شـەودا دزە دەکات، بۆ ئەوەی لەسەر گۆڕی هاوەڵەکانی بوەستێت، ئەوانـەی کە پێشتر گیانیانسپارد پێش ئەوەی سەر خستنی خودا بۆ ئیمانداران ببینن و چاویان لەو خەڵکە زۆرە بێت کە دێنـە نـاو ئـاییني خـوداوە ئەوانە، چون بۆ لای خوای خۆیان لەسەردەمانی کەمیی و نەهامەتی و

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٩٧٤.



ئارامی و دان بە خۆدا گرتندا، بە خوای خۆیان و گەیشتن بە تەواوی پاداشتیان وەرگرت.

پاشان ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ ژمارەی زۆری هاتوان بۆ ناو ئایینەکەی سەرقاڵی نەکردوە، هەروەها سەرگەرمیی فراوانبوونی پارچە گەورەکەی ئیسلام لەبەرچاویدا بێ ئاگای نەکردووە، دەبینی کە لە کاتی حەوانەوە خۆی دەگرێت و بۆ ساتێك دەوەستێ لەبەردەم گۆڕەکانیاندا، یادەوەری و ئاوێزەی پیرۆزیان یاد دەکاتەوە لەبەردەم دیمەنێکی پڕ لە دوعا و وەفاداریدا.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو ماڵئاوایی دەچوو، بۆیە خواحافیزی لە مردووان و زیندووان دەکرد پێش ئەوەی بە دۆستە پایەبەرزەکەی و پلەو پایە باڵاکەی بگات.



# خەوە نوچکەی بەرەبەیان



کە کاتەکانی شەو دەگوزەران و تارماییەکی دواشەوگار و شەشیەکی کۆتایی نەبێ شتێکی لێ نەدەمایەوە، پێغەمبەر ﷺ دەچووە جێگاکەیەوە، بۆ حەوانەوە جەستەی پیرۆزی پاش شەوگارێکی درێژی پڕ لە تەسبیحات، یاد و نوێژ و نزا و پاڕانەوە بۆ خزمانی زیندوو و هاوڕێیانی مردوو، خەوەنوچکەیەکی دەکرد بۆ حەوانەوەی جەستە شەکەتە ڕاوەستاوەکەی لە شەونوێژدا و سازدانەوەی بۆ پێشوازی نوێژی بەیانی و کاروباری ڕۆژانە بە گوڕوتینەوە کە بێدەنگی ساتە وەختەکانی بەربەیان دەشکێنێ دەبینی پێغەمبەرەکەت ﷺ لە شیرینی خەودایە، دایکە بەڕێزەکەمان عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێت- هیچ کاتێك پێغەمبەر ﷺ بەربەیانی لای من نەکردۆتەوە نەخەوتبێت.[1]

لەو خەوە شیرینەیدا دەمایەوە، هەتا ڕووناکی سپێدە تاریکایی نیوەشەوی دەدڕی، بانگی بیلال ئارامیی مەدینەی دەهەژاند، جا پێغەمبەر ﷺ لە خەو ڕادەچەنی و ڕۆژێکی نوێی پێغەمبەرانە

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١١٣٣. صحيح مسلم: ٧٤٢.



دەستی پێدەکرد، ڕۆژێکی بۆندار بە هەناسەی پێغەمبەرانە، ڕووناک بە پرشنگی پەیامەکەی.





# خوێندنەوەیەك بۆ ڕۆژێکی پێغەمبەرانە



ڕۆژێکی پێغەمبەرانە بڕگەیەکی ستوونی پێکدەهێنێت لە ژیانی بەرفراوانی پێغەمبەرێتیدا، لەو سۆنگەیەوە چەپکەگوڵێك لەمانا قووڵەکانیمان دێتە بەردەست.

١- ئەو ڕۆژە پێغەمبەرانەیە، دەفرێکی زەمەنی پڕ لە دەستکەوتی هەرە گەورەیە، کە لەسەر دەستی ئەو پێغەمبەرەدا ﷺ هاتوونەتەدی، پێشتر لەو شێوە دەستکەوتەی بە خۆوە نەبینیوە کە لەسەر دەستی پێغەمبەری خۆشەویستدا ﷺ هاتۆتە دی.

٢- ئایا ڕۆژانە ئەو زۆر ڕوونیەت هەست پێنەکردوە لە ژیانیدا ﷺ کە تا ئاستی درەوشانەوە دەڕۆشت، لە ژیانیدا گوشەی تاریك و ئەڵقەی ون نیە، بەڵکو هەموو بارەکانی ڕوون و ئاشکرا و دیار بوون، تەنانەت کە دەرگاکەی بەسەر خۆیدا دادەخست، ئاگامان لە ژیانی بوو، کاتێ لەگەڵ هاوسەریدا لەناو جێگادا دەنووست، دەنگی هەناسەی پیرۆزیشی لە خەودا و، یەکەم وشەیەك کەلە کاتی لەخەوهەستانیدا لەدەمی پیرۆزی دەردەچوو.



لەکاتێکدا کە بەدواداچوونم دەکرد بۆ بەرنامەی ڕۆژی پێغەمبەرانە هەستم دەکرد ئەوەندەی لەبارەی پێغەمبەرەوە شت دەزانم زیاترە لەوەی لەبارەی باوکمەوە دەیزانم، خۆم و دایك و بابم بە قوربانی بین، بەڕاستی ئەو پێغەمبەرە ﷺ ڕووخسار گەش بوو، لەژێر ڕوشنایی خۆردا ژیانی دەبردەسەرە.

٣- لەم ڕۆژە پێغەمبەرانەدا، دەردەکەوێت کە قووڵترین و درێژخایەنترین پەرستشی ئەو ﷺ ئەو خواپەرستیانە بوون کە لە ئارامی شەودا و لە ناو ماڵەکەی خۆیدا دەیکرد و خوی پێوە گرتبوو و لەسەری بەردەوام بوو، هەتا بە خودای خۆی گەیشت، ئەوەش ئاماژەیەکە لە ئاکارەکانی پێغەمبەرێتی، چونکە هەرگیز ناکرێ ئەو لاڵانەوە درێژخایەنە ڕێکوپێکەی بەهەموو تەمەنی بەردەوام بوو لەسەری لاف لێدان و هەڵبەستن بێت، دووربێ لە پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو بەڵگەیەکی تەواوە لەسەر متمانەیەکی حاشا هەڵنەگری ڕاستگۆیانە و باوەڕێکی قووڵ بە وتە و بانگەشەکانی خۆی ﷺ.

٤- شتێکی دیکە تا ئاستی واق وڕمان سەرنجت ڕادەکێشت ئەوەیە، کە ئەو پێغەمبەرەی ﷺ مژدەی پێدراوە کە چاوپۆشی کراوە لە گوناهی پێشین و پاشینی، هەموو ڕۆژێکی بەسەدجار (استغفر الله) پێشوازی دەکرد و، لەناو دانیشتنێکدا زیاتر لەسەد جار (استغفر الله و أتوب إليه) بۆ ئەژماردەکرا، پاشان بەئەوپەڕی ملکەچی و لاڵانەوەوە لەشەونوێژەکانیدا داوای لێخۆشبوونی دەکرد و دەیفەرموو: "اللهمَّ



**اغفرْ لي ما قدَّمتُ وما أخرتُ ، وما أسررتُ وما أعلنتُ ، وما أنت أعلمُ به منِّي، أنت المقدِّم وأنت المؤخِّر ، لا إله إلا أنت "**. واتە:"خودایە لە هەموو گوناهەکانم خۆش بە و، پێشینم و پاشینم، پەنهانەکانم، ئاشکراکانم، ئەوانەش کە خۆت لەمن باشتر دەیانزانیت، هەرتۆ پێشخەری، هەر خۆت دواخەری، جگە لە تۆ پەرستراوێکی تر نیە".

بەم داوای لێخۆشبوونەوە دەپاڕایەوە لەکاتێکدا کە لە گوناهی پێشین و پاشینی چاوپۆشکراوە، کە پارێزراوە لەهەر گوناهوتاوانێك، ئەی دەبێ ئێمە چۆن بین؟ ساتەکانی ژیانمان خەریکە بەبێ هەڵە و گوناهی ڕۆژانە تێئەپەڕێت، خودایە، بەزەییەك.

٥- کە سەرنجی دەقپێوەگرتنی ئەو پێغەمبەرە ﷺ دەدەیت بەیادی خوا، وا هەست دەکەیت کە ئەو پێغەمبەرە ﷺ لە حاڵەتێکی پڕ لە تاسەو ئەوینی خودا دەژی، هەروەکو گەورەیی خودای لەبەرچاوان بێت، زمانی بە یادی ئەو نەدەوەستا، یادی ئەو یەکەم شتی سەر زاری بوو کە هەڵدەستا، دوایین شتی سەر زاریشی بوو کە خەو دەیبردەوە، ڕۆژانە سەر لەبەیانی و ئێوارانی بە یادی خودا بەڕێ دەکرد، لەو نێوەندەدا هەمیشە زمانی بەیادی خوادا پاراو بوو، ئەمە مانای بوونی خواپەرستی و خۆشەویستییە بۆ خودای گەورە.

٦- سەرنجی پێشخستنی ئەنجامدانی هەموو نوێژەکانی دەدەین، لەکاتی خۆیدا جگە لە نوێژی خەوتنان کە هەندێ جار لەسەری دەوەستا.



٧- گوتارەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ هاوەڵانی هەمیشە دوای نوێژەکانی بوو، زۆرجاران دوای نوێژی بەیانی و نیوەڕۆ بوو، چونکە خەڵك چالاك بوون و ماندوێتیشیان دەرچوو بوو، ئەو دوو نوێژە خەوی شەو و خەونوچکەی چێشتەنگاویان لەپێشەوە بوو، زۆربەکەمی دوای نوێژی عەسر و خەوتنان گوتاری دەدا، چونکە خەڵك شەکەت بوون و پێویستیان بە حەوانەوە بوو، نەبیستراوە کە دوای نوێژی شێوان (خۆرئاوابوون) قسەی کردبێت، چونکە خەڵکی دوای ئەو نوێژە نانی ئێوارەیان دەخوارد، بۆیە لەسەرەتای ڕۆژەکەوە دەستپێشخەری دەکرد، درێژەی نەدەدا بە قورئانخوێندن و دوای ئەویش قسەی نەدەکرد.

٨- هاوسەنگی لە بەجێهێنانی مافەکان و تێگەشتن لە سەرجەم بزاوتەکانی ژیان، شێوازی بەجێهێنانی بۆ خواپەرستی و گەیاندنی پەیامەکانی و هەستانی بە دابینکردنی مافی خێزانەکانی و هەڵسوکەوتی لەگەڵ هاوەڵانی و ڕەچاوکردنی مافی خودی خۆی چەندینی تر لە داواکارییەکانی، هەموو ئەمانە بەشێوازێکی هاوتەریب و هاوسەنگ بەڕێوەدەچوون، بەبێ ئەوەی کەموکوڕیەك ببینی لە بەجێهێنانی مافێکدا یان لاسەنگییەك لە بەجێهێنانی ئەرکێکدا، بەڵکو بەتێگەیشتنێکی هاوسەنگانەوەبوو بۆ هەموو مافە تایبەت و گشتییەکان، بەشێوەیەك دەتبینی کە ژیانی شێوازێکی کرداری بوو بۆ ڕاسپاردەکانی، ڕۆژانێك کە دەیفەرموو : **"بەڕاستی جەستە مافی**



هەیە بەسەرتەوە، چاوت مافی هەیە بەسەرتەوە، هاوسەرت مافی هەیە بەسەرتەوە، میوانەکەت مافی هەیە بەسەرتەوە، ڕۆڵەکەت مافی هەیە بەسەرتەوە، هاوڕێکەت مافی هەیە بەسەرتەوە".[1] بەڕاستی خۆی مافی هەموو خاوەن مافێکی دەدا.

٩- جێگەی سەرنجە لەگەڵ ئەوەدا کە ژیانی جەنجاڵ و گەرموگوڕ بوو، بەڵام نە گرژ و شپرزە بوو، لەگەڵ سەرقاڵی زۆر و قەرەباڵغی دەوروبەریدا، دڵ و دەروونی هێمن و ئارام بوو، هەستت بە تێکچوون و ئاڵۆزی نەدەکرد، کە سەیرت دەکرد گومانت دەبرد کە پێش ئەوە یان پاشی هیچ کارێکی تری هەبێ، حاڵیشی لەماڵەکەیدا ئەوەی پێوە دیار نەبوو کە باری ژیان لەدەرەوە چاوەڕوانی دەکات، دانیشتنی لەگەڵ هاوەڵەکانیدا ئەوەی پێ نەدەگوتین کە ئەو لەحاڵەتی هەستان بەکارێك یان دڵەراوکێی چاوەڕوانییەکە، بەهەموو هەستەکانی ڕووی تێ دەکردن، بەئارامی لەگەڵیان بوو، ڕەوشتی بەرزی بەشی هەموویانی دەکرد، هەروەکو ئەوەی تەنها کاری ئەو ڕۆژەی دانیشتن بێت لەو شوێنەیدا، ئەمە حاڵەتێکی هێوربوونەوەی دەروونی بوو، هەموو کارەکانی لە خۆ دەگرت بێ ئەوە بشلەژێ یان شپرزە ببێت.

١٠- سەرنج دەدەین کە ژیانی پێغەمبەر ﷺ ڕێکخراوبوو، بێ ئەوەی توند و زبر بێت، ڕێکخرابوو، بەڵام نەرمونیانیش بوو، بەشێوەیەك

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١٩٦٨، ١٩٧٤، ١٩٧٥، ٦١٣٩. صحيح مسلم: ١١٥٩.



دەرفەتی هەبوو بۆ نەرمینواندن بەپێی پێداویستی حاڵەتەکە، ژیانی پشێوی و شڵەژانی تێدا نەبوو، هەروەها ژیانی توندی و زبری تێدا نەبوو، بەڵام ڕێکسازی و نەرمونیانی هەبوو، بۆ نموونە: کاتی نوێژەکان دیاری کراو بوون، نێوەندەکانی ڕێك دەخست، کاتی دانیشتنەکانی بەپێی پێداویستی ڕۆژەکە، هەندێ جار کورت یان درێژ دەبوون، بۆیە لەژیانی خۆیدا سوودەکانی ڕێکخستنی کار دەردەکەوتن، خۆی ڕزگار دەکرد لە لایەنی خراپی و توندی و چەقبەستوویی و زبری.

١١- کاتێك سەرنجی ژیانی پێغەمبەر دەدەین ﷺ، هەڵچوونێکی ئاسایی ژیانی پیرۆزی ﷺ دوور بوو لە خۆقورسکردنی دەستکرد و توندوتیژی، بەڵام خۆ ئەو حاڵەتە سروشتییە ئاساییەش کاریگەری خۆی هەبوو، لەگەڵ خۆشیدا خۆشتر دەبوو، لەساتی خۆشیدا هەڵدەبەزیەوە هەتا هەندێ جار کە بەهاوڕێیەکی دوورەڕێی بزربووی دەگەیشت جبەکەی سەر شانی پیرۆزی دەکەوتە خوارەوە بە ڕێگەدا دەڕۆشت، گەنجێکی دەبینی مەڕێکی سەربڕی بوو کەوڵی دەکرد قۆڵی لێ هەڵدەماڵی بۆ ئەوەی پیشانی بدات کە باش کەوڵ کردن چۆن دەبێت، بەلای کابرایەك دەگوزەرا لەمەنجەڵێکدا گۆشتاوی لێ دەنا و پێی دەفەرموو کە پێگەیشت نانمان دەرخوار بدە، ئەم شێوە ئاساییە لە مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا هەموو بەربەستەکانی تێکشکاندبوو،



دەچووە نێو دڵەکانەوە، ئەوانیش دەچوونە دڵیەوە، بۆیە واهەستیان دەکرد کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ وەکو ڕۆڵە و باوکن.

١٢- هەمیشە خۆشی و ئاسودەیی لەماڵەکەیدا حازر بەدەست بوو، دەم بەپێکەنین و لێو بەزەردەخەنە بوو، هەمیشە خۆشی هاودەمی دیوەخانی بوو، دەرفەتی هەبوو بۆ گاڵتەی خۆش و گەمە و خۆشخوانی، ئەمە لە ژیانیدا هەمیشە ئامادەبوون، ئەو کە دەچووە دەرەوە بۆ لای حەبەشیەکان، کە یاریان دەکرد لە ناو مزگەوتدا چێژی لەسەیرکردنیان دەبینی و، بەردەوای دەزانی، بانگی هاوسەری دەکرد بێت و، لەبینینی ئەو خۆشیەدا لەگەڵی بەژداربێت، پاشان وەك ڕەوا زانینێك بۆ ئەو گەمەیە دەیفەرموو: **"هۆ کوڕانی ئەرفیدە گەمەوگاڵتەی خۆتان بکەن هەتا جولەکە و گاور بزانن لە ئاینەکەماندا دەرفەت هەیە"**، بەڕاستی ئاینەکەی دەرفەتی تێدا بوو، بۆیە لە ژیانیشیدا دەرفەت و ماوە هەبوو بۆ خۆشی و ئاسودەیی.

١٣- پتەوی پەیوەندی سۆزداری خێزانی و دامرکانەوەی ئەو سۆزە لەپێدانی جامۆڵکەیەکی ئاو، لەبەدەمەوە کردنی پاروە نانێك و، لەچرپە و هەناسەیەکی شەوانە و، بە سەردانێکی ڕۆژانە و، لەبەژداری کاری ناوماڵ و، لەبەردەوامی خۆشەویستی ژن و مێردایەتی ناو جێگە و ژێر لێفەدا، دەردەکەوت.

١٤- تێگەیشتنی لە سروشتی خەڵکی و پێداویستی و کاروباری ژیانیان تەنانەت لە شێوازی جێبەجێکردنی خواپەرستیدا لەهەموو



کەس کورتتر نوێژی دەکرد ئەگەر بۆ خەڵکی نوێژی کردووە، لەکاتێکدا بەتەنها نوێژی بکردایە لەهەموو کەس زیاتر درێژەی پێدەدا، کە نوێژی دادەبەست حەزی دەکرد درێژەی پێبدات، گوێی لە گریانی منداڵ دەبوو کورتی دەکردەوە، پێی وابوو کە دایکی دڵی بۆی دەسوتێت.

١٥- شەونوێژەکانی درێژترین نوێژ بوون لەڕووی گیان ئامادەیی و تاسە و چێژی پاڕانەوەوە، ئەوەش حاڵەتێك بوو لە حاڵەتەکانی درەوشانەوەی گیانی و ڕۆچوون بە قوڵایی خواپەرستیدا.

١٦- دەکرێ بڕگەکانی چالاکی بکەین بە سێ بەشەوە، ماوەی چالاکی و جموجۆڵ بێگەردی لەشەو نوێژدا، چونکە هەستانی بۆ شەونوێژ پاش درێژترین کاتی خەوی بوو لە نیوەی یەکەمی شەودا، هەروەکو بیەوێ چڕی گورجوگۆڵی خۆی هەڵگرێ بۆ ئەو کاتە، چونکە نوێژەکانی مایەی حەوانەوە و ڕووناکی چاوەکانی بوو، پاشان دوای سپێدە کە دەکەوتە داوی خەوەنوچکەی بەرەبەیان نوێژی بەیانی دەکرد و، یادی پەروەردگاری خۆی دەکرد.

پاشان لای هاوەڵەکانی دادەنیشت ئامۆژگاری و زانست و پەروەردەی پێ دەدان، پاشان نوێژی نیوەڕۆش کە دوای خەوەنوچکەی قەیلولە بوو، نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، ئەگەر شتێك ڕوویبدایە گوتاری دەدا، یان لای هاوەڵەکانی دادەنیشت، قسەی لەگەڵدا دەکردن و، پێداویستییەکانی دابیندەکردن.






١٧- جێگەی سەرنجە کە نوێژەکان بڕگەی جیاکەرەوەی پیادەکان بوون، کات دابەش دەبێت بۆ چەند یەکەیەکی کاتی کە نوێژەکان نێو بەندی دەکەن..

١٨- دەکرێ کە بەرنامەی ڕۆژی پێغەمبەرانە بە شێوازی نزیکەیی بەم شێوەیەی خوارەوە دابەش بکەین:

أ- بەرەبەیان: تیایدا هەڵدەستا بۆ نوێژی بەیانی، پاش خەوەنوچکەی بەیانیان، نوێژی بەیانی دەکرد لەگەڵ هاوەڵەکانیدا، لەسەر شوێنی نوێژەکەی تا هەتاوکەوتن دەمایەوە، پاشان سەردانێکی بەیانیانی دەکرد بۆلای خێزانەکانی، پاشان لەسەرەتای چێشتەنگاودا لەمزگەوت لەگەڵ هاوڕێیانی دادەنیشت، ئەو دانیشتنە بۆ یادی زانست و پەروەردە بوو، هەندێ جاریش پاش دانیشتنکە سەردانی دەکرد، هەندێ جار سەردانی کچەزاکانی دەکرد، یان سەردانی هەندێ هاوەڵی دەکرد، یان دەچوو بۆ ئەنجامدانی کارێکی تایبەتی خۆی.

ب- نیوەڕۆ: هەڵدەستا بۆ نوێژی نیوەڕۆ، ئەگەر شتێك ڕوویبدایە دوای نوێژ وتاری دەدا، زۆرترین وتارەکانی لەو کاتەدا بوو، پاشان دەگەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆیی و سوننەتەکانی دوای نوێژی دەکرد، پاشان دەچووە دەرەوە بۆ لای هاوەڵەکانی، یان بۆ ئەنجامدانی کارێکی خۆی، زۆر جار کاتی نیوەڕۆ و عەسر کاتی کار و ئەنجامدانی پێداویستییەکان بوو.






جـ- خۆرئـاوابوون: لەسـەرەتای کاتەکـەدا نوێـژی مـەغریبی دەکرد، لەگەڵ خێزانەکانیدا دەمایەوە، هەندێ جار دەچـوو سـەردانی چەند هاوەڵی پشتیوانی دەکرد، یان لە لای ئەبوبەکر و عومەر لەماڵی ئەبوبـەکر دەمایـەوە -ڕەزای خوایـان لـێ بێـت-، بـۆ ڕاوێـژ کـردن سـەبارەت بـە کاروبـاری دەوڵـەت و پرسـی موسـوڵمانان، پاشـان دەگەڕایەوە ماڵەوە دەنووست هەتا نیوەشەو، کە نیوەشەو دەگوزەرا هەڵدەستا شـەونوێژی دەکـرد، پـاش ئـەو خەوتنـە لـە چڵەپۆپەی گرجوگۆڵیـدا بـوو، بـەو شـێوازی نوێـژ و پاڕانەوەیـەوە بـە ئەنـدازەی سـێیەکی شـەو دەمایـەوە، هـەتا کـاتی شەشـیەکی شـەو دەمایـەوە، ئـەنجا دەهاتـەوە نـاو جێگـەی نوسـتنەکەی بـۆ حەوانـەوە و خەوەنوچکەی بەرەبەیان، پاشان بۆ نوێژی بەیانی هەڵدەستا.





## پێڕست



